گەڕانەوە بۆ لای خوا ﷻ

نووسینی: عەلی باپیر



چاپی شەشەم ٢٠٢١ز- ١٤٤٢ك



**نوسینگەی تەفسیر**

بـۆ بڵاوكـردنـەوە

هەولێر- شەقامی 30 مەتری تەنیشت منارەی چۆلی

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com

/TafseerOffice

ئامادەکردنی پێڕست - نوسینگەی تەفسیر

گەڕانەوە بۆ لای خوا ﷻ،

عەلی باپیر (نووسەر)،

٢٢٩ لاپــەڕە ،

١٧* ٢٤ ســم ،

بابــەت ، ئایینی

ISBN: 978-9922-632-71.1

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتیەکان - هەرێمی کوردستان

ژمارە سپاردنی ( ٤٢٠ ) ی ساڵی ٢٠٠١ ز پێدراوە.

"بیروبۆچوونی ئەم کتێبە، مەرج نیە هەمان بیرو بۆچونی نوسینگەی تەفسیر بێ"

**خــەتی بــەرگ : نـــەوزاد کۆیـــی**

**دیزاینی ناوەوە : زەردەشت کاوانی**

# گەڕانەوە بۆ لای خوا سبحانه وتعالى

بەرەو خوا وەرچەرخان و، واز لە گوناح و سەرپێچیی هێنان و،
گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان

نووسینی

عـــەلـــی بـــاپـیر

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ
ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓاْ
إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا
تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ ﴾

- سورەتی الزمر -

## پێشکەشە

بـە هەمـوو ئـەو کەسـانەی کـە بـەرەو خـوای بەرزو مـەزن دەگەڕێنەوە:

١- چ لـە کوفـرو شـيرك و نيفاقـەوە، بـۆ ئيـمان و خـوا بـە يەکگرتـن و سـاغيی و ڕاسـتيی.

٢- چ لـە گونـاح و تاوانـە گـەورەو گچکەکانـەوە، بـۆ خـوا پەرسـتيی و فەرمانبەريـی.

٣- چ لـە بـێ ئاگايـی و تـەم و مـژەکانی سـەر دڵ و دەروونـەوە، بـۆ دڵ بێداريـی و صەفـاو بـێ خەوشـيی.

بە ئومێدی ئەوە کە مايەی بەرچاو ڕوونيی
زياتريان بێ لەو سەفەرە پڕ خێروبێرەی
تەمەنياندا.

# پێشەکی چاپی شەشەم

الحَمدُ لِلَّهِ نَستَعِينُهُ وَنَستَغفِرُهُ، وَنَعُوذُ بِاللَّهِ مِن شُرُورِ أَنفُسِنَا، مَن يَهدِهِ اللَّهُ فَلَا مُضِلَّ لَهُ، وَمَن يُضلِل فَلَا هَادِيَ لَهُ، وَأَشهَدُ أَن لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَشهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبدُهُ وَرَسُولُهُ

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُسلِمُونَ)

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُم الَّذِي خَلَقَكُم مِن نَفسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنهَا زَوجَهَا وَبَثَّ مِنهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأَرحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيكُم رَقِيبًا)

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَولًا سَدِيدًا يُصلِح لَكُم أَعمَالَكُم وَيَغفِر لَكُم ذُنُوبَكُم وَمَن يُطِع اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَد فَازَ فَوزًا عَظِيمًا)

خوێنەری بەڕێزو خۆشەویست !

خوای بەرزو مەزن و کاربەجێ - سبحانە وتعالی - ئێمەی مرۆڤ - هەروەها جندیش - ی بەبێ ویستی خۆمان لەم سەرزەوییە داناوە، خستووینیە تاقیکردنەوەوە، وەك فەرموویەتی:

﴿ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ۝٢﴾ الملك: ٢

واتە: ( خوا ئەو کەسەیە مردن و ژیانی هێناونەدی، تاکو تاقییتان بکاتەوە، کامەتان کردەوەی چاکترە، ئەویش زاڵی لێبوردەیە).

ئنجا خوای کارزان و زانا شێوەی پێکهاتەشمانی - بە دەروون و ڕواڵەتەوە - وا هەڵخستوە کە بتوانین خۆمان پاك و چاك بکەین و بەرزبین، یاخود، خۆمان

پیس و خراپ بکەین و پەست و نزم بین، کە دیارە لە حاڵەتی یەکەمدا، خۆشمان شادمان و سەرفراز دەبین و، خوای بەرزو بێ وێنەیش ڕازی دەکەین و، لە حاڵەتی دووەمیشدا، خۆشمان پەشێمان و بێمراد دەبین و، خوای بەرزو بێ هاوتاش تووڕە دەکەین، وەك خوای بە بەزەیی فەرموویەتی:

﴿وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّىٰهَا ﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَىٰهَا ﴿٨﴾ قَدْ أَفْلَحَ مَن زَكَّىٰهَا ﴿٩﴾ وَقَدْ خَابَ مَن دَسَّىٰهَا ﴿١٠﴾﴾ الشمس: ٧ - ١٠

ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە هەمیشە شەیتانی بەدفەڕ، لە مرۆڤ و جند لە بۆسەدایەو، بەردەوام سەرگەرمی فرت و فێڵ و فریودان و کڵاو لەسەرنانیانە، خوای کارزانی میهرەبان بە بەردەوامیی دەرگای پەشێمانیی و بۆ لا گەڕانەوەی، بۆ ئەو دوو دروستکراوە تاقیکراوەیە، خستۆتە سەرپشت، بێ ئەوەی پابەندیان بکات بە هیچ کات و شوێن و حاڵێکەوە، بەڵکو وەك پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: خوا بەیانیان چاوەڕێی گەڕانەوەی گوناهکارانی شەوێ و، ئێوارانیش چاوەڕێی گەڕانەوەی گوناهکارانی ڕۆژێ دەکات، تاکو لێیان ببووریٚ.

هەربۆیە گەڕانەوە بۆ لای خوا و داوای لێبوردن لێ کردنی، گرنگترین و سەرەکییترین هۆکارو ئامرازی بەردەستی مرۆڤ و جندە، بۆ بەردەوام لە خۆ وریابوون و خۆ پاك ڕاگرتنیان و لە خوا نزیك بوونەوەیان.

شایانی باسیشە:

مرۆڤ بە ئەندازەی خوا ناسینی و لە خوا نزیك بوونی و بۆ خوا صوڵحانی، هەست دەکات کە پێویستە هەرچی زیاتر بۆلای بگەڕێتەوەو داوای لێبوردنی لێ بکات، هەربۆیەش لە قورئانێدا خوای بەرزو مەزن، ئەو حاڵەتەی لە هەموو کەس زیاتر لە پێغەمبەرانەوە - علیهم الصلاة والسلام - گێڕاوەتەوە هەر لە ئادەمەوە هەتا خاتەم.

ئـەم کتێبـەش - کـە ئێسـتا چاپـی شەشـەمی دەکەینـەوە - گرنگتریـن کتێبـی بەندەیـە لـەو بـوارەداو، کاتـی خـۆی وردەکاریـی زۆرم تێـدا کـردوەو، هیـوادارم لـەم چاپـی شەشـەمەدا - کـە نووسـینگەی تەفسـیر چاپـی دەکات - لـە جـاران پتـر مایـەی بەهـرە لێوەرگرتـن بـێ، چونکـە لـە ڕابـردوودا هـەر پێنـج چاپەکـەی هـەر جـارە لـە شـوێنێك کـراون و، هـەزاران نوسـخەی لـێ چـاپ و بـڵاو بۆتـەوە، لـەم چاپەشـدا سـێ گۆڕانکاریـی گرنگمـان لـەم کتێبـەدا کـردوون:

١- دەقەکانی سوننەتمان وردترو بە ژمارەکانیانەوە (تخريج) کردوون.

٢- بە وردیی و وشە بە وشە هەڵەچنییم بۆ کردوە.

٣- هەندێك لە پەراوێزەکانمان هێناونە نێو دەق (متن)ی کتێبەکەوە.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين،

والحمدلله رب العالمين

١٤٤٢/٤/٩ك

٢٠٢٠/١١/٢٤ز

## پێشەکی چاپی پێنجەم

الحمـد للـه وحـده، و الصلاة والسلام علـى مـن لانبِـيَّ بعـده، محمـد وآلـه السـالكين دَرْبَه.

خوێنەرانی سەنگین و شیرین!

سـتایش و سوپاسـگوزاریی شایسـتە بـۆ خـوا - تبـارك وتعالـی -، ئـەوە ئـەم کتێبـەی بەردەستتان بـۆ جاری پێنجەمیـن چـاپ و بڵاو دەکرێتـەوەو، ئەمجارەشیان برایانـی خۆشەویسـتم لـە: (ناوەنـدی ڕاگەیاندنـی ئـارا) بـەم شـێوە جوان و دڵگیـرە هەڵسـاون بـە چاپکردنـەوەی، خـوا هێزوپێـزی پتـر بخاتـە کاروباریانـەوە و، هـەر سـەلامەت و سـەرفرازو گـورج و گـۆڵ و بەگـوڕ بـن.

لـە سـۆنگەی ئەوەشـەوە کـە لـە پێشـەکی چاپەکانـی دیکـەی ئـەم کتێبـەدا، شـتی زۆرمـان لەبـارەی (گەڕانـەوە بـۆلای خـوا سـبحانه وتعالـی) گوتـوە، لێـرەدا بـە پێویسـتی نازانـم هیـچ بڵێـم، جگـە لـە ئاماژەکـردن بـۆ مەسـەلەیەکی گرنـگ و هەسـتیار، کـە پێشـتر قسـەمان لەبارەوە نەکـردوە، ئەویـش بریتیـە لـە بەرپرسـیارێتیی (مسـؤولية)مان بەرانبـەر بەوکەسـانەی کـە بەهـەر هۆیەکـەوە بـووە، دڵیـان نـەرم دەبـێ و بڕیـاری بـۆلای خـوا گەڕانـەوە و، لەگەڵیـدا ئاشـتبوونەوە دەدەن:

کـە بێگومـان ئـەو جـۆرە کەسـانە، وەك بابـای تـازە لـە نەخۆشـیی دەربازبـووی لەسـەر جێگای نەخۆشـیی هەڵسـاو وان و، پێویسـتییان بـە هاوکاریـی و چاودێریـی و مشـوورخۆرییەکی تایبـەت هەیـەو، ئـەوەش ئەرکـی شـەرعیی کۆمەڵگاو دەوروبـەرە بەگشـتی، کـە کارێـك بکـرێ ئـەو جـۆرە کەسـانە دەسـتیان بگیـرێ و، بخرێنـە سـەر ڕێیەکـی ڕاسـت و ڕەوان و کاریـان لەسـەربکرێ، کـە دینداریيەکـی هاوسـەنگ

(مُـتـّـزن)و ڕێك و ڕاست و پلەپلەیی دەست پێبکەن و، لە زێدەڕۆیی و بەزایەدان (إفـراط وتفریـط) پارێزراو بن، چونکە بێگومـان حاڵەتـی تێپەڕانـدن و کورتهێنـان (الغلـوّ والتقصـیر) هەمیشە تەمەنیان کـورت دەبێ و، خاوەنەکەیان زۆر بڕناکات.

خواش بە بەزەیی بێسنووری خۆی، هاوکارو دەستبارگری هەموو لایەکمان بێ بۆ بەندایەتیی و دینداریيەکی هاوسەنگی ساغ و ڕاست.

(٥)ی ذي القعدة ١٤٣١ك، بەرانبەر:

(١٣)ی تشرینی یەکەمی ٢٠١٠ز

هـــــەولێـــر

## پێشەکی چاپی چوارەم

الحمدلله حق حمده، وصلاته وسلامه وبركاته على عبده محمد النبيِّ الخاتم المصطفى وآله المهتدين بهداه والسائرين على دربه.

خوێنەری سەنگین و شیرین!

ستایش بۆ خوای تاك و پاك ئەوە بۆ جاری چوارەم کتێبی: (گەڕانەوە لای خوا) چاپ دەکرێتەوە، تاکو ژمارەیەکی زیاتری خوێنەران دەستیان لێی گیربێ و لێی بەهرەمەندبن، چونکە لەمێژە بەهۆی لەکتێبخانانـدا نەمانی، داواکاریی لەسەرەو لەبەر سەرقاڵ بوونم بەبەرهەمە تازەکانمەوە، دەرفەتی پێداچوونەوەم نەبوو بۆ سەرلەنوێ چاپ کردنەوەی و، حەزیشم نەدەکرد بەبێ چاوپێداگێڕانەوەی وردی خۆم، چاپ بکرێتەوە، وەك عادەتی خۆم لەگەڵ سەرجەم کتێب و نامیلکەکانمدا. ئەوەی کە لە پێشەکی ئەم چاپە تازەیەشدا بەپێویستی دەزانم ئاماژەی پێبدەم، ئەوەیە کە بەڕاستیی لەڕۆژگاری ئێستاماندا، خەڵك و کۆمەڵگایەکەمان بەگشتیی و، بەتایبەت چینی گەنج و تازە پێگەیشتوومان بەهەردوو ڕەگەزەکەوە، فشارێکی زۆریان کەوتۆتە سەر، لەڕووی ئەخلاقییەوە، ئەویش لەسۆنگەی چەند هۆکارێکەوە کە لەهەمویان کاریگەرتر بەخراپ و هەڵە، یان بەمەبەست و ئامانجی گڵاو و پیس، بەکارهێنانی هۆیەکانی ڕاگەیاندنە، بەتایبەت لەلایەن حیزبە حوکمڕان و هەموو شت بۆخۆ قۆرخکەرەکان و هەندێك بڵاوکراوە، کە جێبەجێکەری پرۆژەو ئەجێندایەکی نامۆو بەزەرن بۆ خەڵك و کۆمەڵگایەکەمان.

ئنجا لەئاوا هەل و مەرجێکدا، دیاردەی گوناحباریی و خلیسکان بەرەو زەلکاوی تاوان، ڕۆژ بۆ ڕۆژ لەتەشەنەکردن دایە، بەتایبەت لەنێو ئەو کەسانەدا کە بەداخەوە خاوەنی ماڵ و خێزانێکی مسوڵمان و تۆکمەو دامەزراونین و،

پەروەردەیەکی وا نەکراون و ناکرێن کە بەرگریی (مَناعة)ی لـە گوناح و خلیسـکان و هەڵخەڵەتانیـان تێدا پەیدا بـکات!

بەڕاستیی سەریشم سوڕماوە لەکەسانێك کە خاوەن مەقام و پلەی بەرپرسیاریین لەکۆمەڵگاکەماندا، کەچی جارێك لەجاران هەر لێشیان نابینرێ و نابیسترێ، کە لـەڕووی پـەرۆش و دڵسـۆزییەوە بۆ خەڵك و وڵاتیـان، هەنگاو و هەڵوێسـتێك دەربـڕن لەوبارەوە، ئەگـەر تەنیا بـە هۆشیارکردنەوەی خەڵك و ئاگادارکردنەوەشیان بێ، لـەو ئـاکام و سـەرەنجامە مەترسییدارەی کـە کۆمەڵگاکەمـان بـەرەو ڕووی دەچێ، ئەگـەر لەسـەر ئـەو ڕێتم و هەوایـە بڕوا، کـە ئێستا ملی لێناوە!

بەهەرحاڵ هیـوادارم ئـەم کتێبـە کـە لێکۆڵینەوەیەکی خەسـت و خۆڵـە لەبارەی تۆبەکردن و بـەرەو خوا گـەڕانـەوەوە، ڕۆڵێکی بـاش لەوبوارەدا بگێڕێ و، بەهۆیـەوە ژمارەیەکـی بـاش لەگەنـج و تـازە پێگەیشـتوانمان لـە لادان و خلیسـکان بـەرەو زەلـکاو و هەڵدێـری گوناهـ و تـاوان پارێزراوبـن، یـان ببێتـە هـۆکاری بادانـەوەو بـەرەو خـوا گەڕانەوەیـان و، خـۆ لەچڵـك و چەپـەرو ژەنـگ و ژاری خراپەکاریـی پاککردنەوەیـان و، خـۆ بـە طاعـەت و چاکەکاریـی ڕازاندنەوەیـان. خـواش سـبحانە وتعالـی بەچاکتریـن شـێوە پاداشـتی بـەرزو نەبڕاوەی هەمـوو ئـەو کەسـانە بداتـەوە کـە بەشـێوەیەك لەشـێوەکان هـاوکارو دەسـتبارگری بەنـدەن، بـۆ چـاپ و بڵاوکردنـەوەی کتێـب و بەرهەمەکانـم و، خۆیشـم یـەك دنیـا لێیـان مەمنـوون و بۆیـان سوپاسـگوزارم.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلامٌ على المرسلين، والحمد لله رب العالمين.

٢٨ جمادي الثانية ١٤٣١

٢٠١٠/٦/١١

هەولێر

## پێشەکی چاپی سێیەم

الحمدالله، والصلاة والسلام على رسول الله، محمد وآله المهتدين بهداه:

سوپاس بۆ خوا ئەوا بۆ جاری سێیەم ئەم کتێبەی (گەڕانەوە لای خوا) چاپ دەکرێتەوەو، ئەم چاپەی سێیەمیش لە کاتێکدایە کە بەداخەوە میللەتی مسوڵمانی کوردستانمان، کەوتۆتە بەر لێشاوی هەوڵدانێکی سەخت و خەستی لە خوا دوورخستنەوەی گەنج و لاوەکانمان بە کوڕو کچەوە.

کە بێگومان لە خوا دوور کەوتنەوەو لە ڕاستە ڕێی خوا پەرستیی ترازان، مایەی هەموو نەهامەتیی و گرفتاریی و ژینتاڵیی و بێ حاڵییەکە بۆ تاك و کۆمەڵ.

ئنجا هیوادارم ئەم کتێبە بتوانێ بەر بە بەشێك لەو لێشاوە بگرێ و، لە پووچەڵکردنەوەی ئەو هەوڵە گڵاوەدا، ڕۆڵێکی چاك بگێڕێ و، خوای بە بەزەیی و کاربەجێش بە لوتفی خۆی، گەلی مسوڵمانی کوردستانمان لە سایەی شەریعەتەکەیداو، بەهۆی طاعات و دینداریییەوە، سەربەرزی دنیاو سەرفرازی دوا ڕۆژ بکا.

٢٧ی ڕەبیعی دووەم ١٤٢٦ك

٢٠٠٥/٦/٤ز

سلێمانی

## پێشەکی چاپی دووەم

الحمد لله التواب الرحيم، و على محمد وآله أجمعين أفضل الصلوات وأتمٌ التسليم، إلى يوم يقوم الناس لرّب العالمين، يوم لاينفع مالٌ ولابنون إلاّ من أتى الله بقلب سليم.

خوێنەرە خۆشەویستەکان! ستایشی بێ پایان بۆ خوای خاوەن بەخششی بێ سنوور، کە لە ماوەیەکی زۆر کورتدا کتێبی (گەڕانەوە لای خوا) لە کتێبخانەکاندا نەما! دیارە ئەمەش موژدەو دڵخۆشییەکی گەورەی بۆ ڕەوتی ئیسلامیی (الإتجاة الإسلامی) تێدایە، کە بریتیە لەوەی سوپاس بۆ خوا خەڵك و میللەتمان بەگشتیی و گەنج و خوێندەوارانمان بە تایبەت، لە گەرمەی گەڕانەوە لای خوادان، چ لە کوفرەوە بۆ ئیسلام و[1]، چ لە گوناح و لادان و تاوانەوە بەرەو فەرمانبەریی و پابەندیی و چاکە کاریی.

بۆیە بە پێویستم زانی کە دەستبەجێ ئەم کتێبە چاپ بکەینەوە بە بێ کەمو زیادو بێ دەستکاریی، بەڵام خستنە ڕووی ئەم چەند خاڵە بە پێویست دەزانم:

١- بێگومان هەموو ئینسانەکان بە کافرو مسوڵمان و خراپەکارو چاکەکارەوە، پێویستییان بە گەڕانەوە لای خوا هەیە، چونکە وەك چۆن لە خوا نزیکبوونەوە چەندان پلەی (درجات)ی هەیە، لە خوا دورکەوتنەوەش چەندان نزمیی (درکات)ی هەیە، ئنجا ئەوەی کە خوا نەناسێ، گەڕانەوەکەی بریتیە لە ناسینی خوا (معرفة الله)، و ئەو کەسەی خوا بناسێ، بەڵام ئیمان و بەندایەتیی بەرانبەری نەبێ، گەڕانەوەکەی، ئیمان پێهێنان و

---

(١) میلەتی ئێمە بەگشتیی مسوڵمانە، بەڵام کەم و زۆریش کەسانێك بەرەو کوفرو شیرك و نیفاق خلیسکاون و، لە بازنەی ئیمان و ئیسلامدا نەماون.

بەندایەتیی ئەنجامدان دەبێ، بەڵام کەسێك خواناس و خاوەن ئیمان و خواپەرست بێ، بەڵام کەمتەرخەمیی و هەڵەو پەڵەی هەبێ، تۆبەو گەڕانەوەکەی، بە زیادکردنی تاعەت و چاکەو خۆ بژارکردن لە گوناح و خراپەو هەڵەو پەڵە دەبێ.

کەواتـە: سـەرجەم ئینسـانەکان ئاتاجی تۆبـەو گەڕانـەوە لای خـوان، هـەر بۆیـە خـوای تۆبـە وەرگـرو بەخشـندە فەرمووییەتـی:

﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾ (١)

واتـە: بـەرەو لای خوا ڕابکـەن، (ئـەی خەڵکینـە) بێگومـان مـن لـە لایـەن ئـەوەوە بۆ ئێوە وریا کەرەوەیەکی ئاشکرام.

بەڵـێ جـۆرو چۆنیەتـی تۆبەکـردن و گەڕانـەوە لای خـوای هـەر ئینسـانێك، لـە قـەدەر خۆیەتـی و پڕپێسـتی ئـەو ئاسـتە خواناسـیی و ئیمانیـی و پارێزکاریـی و فەرمانبەرییەیـە، کـە پێـی گەیشـتوە، بۆیـە دەبـێ هۆشـیارو بێداربیـن و، وانەزانیـن کـە تۆبـەو پەشـێمانیی و داوای لێبـوردن کـردن و گەڕانـەوە لای خـوای پێغەمبـەران (علیهـم الصـلاة والسـلام) کـە لـە قورئانـێ دا باسـکراوە، وەك هـی ئێمـەو مانـان بـووە، ئاخـر چـۆن کەسـێك کـە لـە نێـوان چاکتـرو چاکـدا (چـاك) هەڵدەبژێـرێ، پاشـان تۆبـە لـەو هەڵبژاردنـەی دەکا، وەك کەسـێك وایـە کـە لـە نێـوان چاکـەو خراپـەدا، ڕوو لـە خراپـە دەکاو، پاشـان تۆبـە لـەو ڕوو لـە خراپـە کردنـەی دەکا؟!! هـەر بۆیـەش گوتـراوە: (حسـنات الأبـرار سـيئات المقربـين).

٢- ئینسان هەتا لە خوا نزیکترو ئیمان کامڵتر بێ، زیاترو چاکتر هەست بە ئاتاجیی خۆی دەکا بۆ گەڕانەوە لای خوا (التوبة إلـى الله)و داوای لێبوردن لـێکردنی، هەر بۆیەش دەبینین کە پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) کە بێگومان هەڵبژێرراوی ئینسانەکانن لە هەموو ڕووێکەوە، هەر لە ئادەمەوە تا خاتەم، ویردی سەرزمانیان بریتیی بووە لە تۆبەو پەشێمانیی و داوای لێبوردن لە خوا کردن و، دان بە هەڵەو پەڵەی خۆدا هێنان!

---

(١) الذاريات:٥٠.

بۆ وێنــــە:

أ- خوا لەسەر زمانی ئادەم و حەوا عليهما السلام فەرموویەتی:
﴿ قَالَا رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾(١).

ب- هەروەها خوا لەسەر زمانی (نوح) عليه السلام فەرموویەتی:
﴿ وَإِلَّا تَغْفِرْ لِى وَتَرْحَمْنِىٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾(٢).

ج- دیسان خوا لەبارەی (داود)ەوە -عليه السلام- فەرموویەتی:
﴿ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴾(٣).

د- هەروەها خوا لەسەر زمانی (سليمان) -عليه السلام- فەرموویەتی:
﴿ قَالَ رَبِّ ٱغْفِرْ لِى وَهَبْ لِى مُلْكًا لَّا يَنۢبَغِى لِأَحَدٍ مِّنۢ بَعْدِىٓ إِنَّكَ أَنتَ ٱلْوَهَّابُ ﴾(٤).

کەواتە: با هیچ کەس وانەزانێ کە تۆبە، تەنها لە گوناهەکانی وەك قەتڵ و زیناو دزیی و جەردەیی دەکرێ و، تەنها گوناحباران پێویستییان بە تۆبەو پەشێمانیی هەیە! چونکە ئەم جۆرە تێگەیشتنە لە (توبة) تێگەیشتنێکی زۆر سەتحییانەو عەوامانەیە!

٣- زۆر کەس تۆبە تەنها بە پاکسازیی (تطهير) تێدەگا، بەڵام ڕاستییەکەی تۆبەو گەڕانەوە لای خوا، چەندە پاکسازیی و خۆ بژارکردنە لە خراپەو هەڵەو سەرپێچییەکان، هێندەو پتریش چاکسازیی و خۆڕازاندنەوەیە بە طاعەت و فەرمانبەریی و چاکەکان، دەنا ئەگەر وانەبێ، دەبێ تۆبەو گەڕانەوە لای خواو پەشێمانیی و، داوای لێبوردن کردنی پێغەمبەران بەگشتیی و، سەروەرو خاتەمیان بە تایبەتی (على نبينا وعلى

---

(١) الأعراف:٢٣.

(٢) هود:٤٧.

(٣) ص:٢٤.

(٤) ص:٣٥ .

الأنبياء جميعاً الصلوات والتسليمات) بۆچی بووبێ، لە حاڵەتێكدا كە لە هەڵەو گوناح پارێزراو بوون؟!! سەرنج بدە! چۆن خوای كاربەجێ لەكاتی گرتن و ئازادكرانی شاری مەككەدا لە لایەن پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و سوپای ئیمانەوە، كە لە لووتكەی هەرە بەرزی پارێزكارییدا بوون، بە پێغەمبەرەكەی خۆی (صلی الله علیه وسلم) دەفەرموێ:

﴿إِذَا جَآءَ نَصۡرُ ٱللَّهِ وَٱلۡفَتۡحُ ۝١ وَرَأَيۡتَ ٱلنَّاسَ يَدۡخُلُونَ فِي دِينِ ٱللَّهِ أَفۡوَاجٗا ۝٢ فَسَبِّحۡ بِحَمۡدِ رَبِّكَ وَٱسۡتَغۡفِرۡهُۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابَۢا﴾[1].

سا خوا بەكەرەم و لوطفی بێوێنەی خۆی، لەو كەسانەمان بگێڕێ كە تۆبەكردن و گەڕانەوە لای خوا، هۆكاری پاكسازیی و چاكسازییانەو، پەیژەی لە خوانزیك بوونەوەی زیاتریان و، بەندایەتیی كردنی چاكتریان و، ئیمانی كامڵترو دامەزراوتریانە، ئامین.

٣ ذی الحجة ١٤٢٢ - ٢٠٠٢/٢/١٥

هەورامان/ ئەحمەد ئاوا

---

(١) النصر:١-٣.

## پێشەکی چاپی یەکەم

الحمد لله التواب الرحيم، والصلاة والسلام على حبيبنا و شفيعنا محمد المبعوث رحمة للعالمين، وآله أجمعين، ومن دعى بدعوته و سار بسيرته إلى يوم الدين.

خوێنەری بەڕێز!

لە سۆنگەی ئەوەوە کە ئەم کتێبە وتارێکی ڕۆژی جومعەیە کە لە مزگەوتی گەورەی شارۆچکەی (تەکیە) دراوە[1]، کە بە ناو ونیشانی: (تۆبەو گەڕانەوە لای خوا) بووە، ئایەتەکانی ژمارە (٥٣ ، ٥٤ ، ٥٥)ی سورەتی (الزمر) هەوێنی بوون، هەروەها هەر ئەو سێ ئایەتە بە هەمان شێوە، بوونە هەناوو هەوێنی ئەم کتێبەش، بۆیە بە پەسەندم زانی، کە تەفسیرو توێژینەوەیەکی کورتیشیان بکەمە پێشەکی ئەم کتێبە:

خوای بەبەزەیی و بەخشندە فەرموویەتی: ﴿ قُلْ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴿٥٣﴾ وَأَنِيبُوٓا۟ إِلَىٰ رَبِّكُمْ وَأَسْلِمُوا۟ لَهُۥ مِن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴿٥٤﴾ وَٱتَّبِعُوٓا۟ أَحْسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُم مِّن قَبْلِ أَن يَأْتِيَكُمُ ٱلْعَذَابُ بَغْتَةً وَأَنتُمْ لَا تَشْعُرُونَ ﴾[2]

---

(١) لە ساڵی (١٤٢١ك) بەرانبەر (١٩٩٩ز)ەوە هەردووك برای بەڕێز (صلاح الدين) تەكيەيی و (عبدالرحمان) شوانیی لەسەر كاسێتەوە هێنابوویانە سەر كاغەز، خوا پاداشتیان بداتەوە، چونكە هەرچۆن بێ، نووسینەوەكەی ئەوان هۆكارێكی گرنگ بوو بۆ گەڵاڵە بوونی بیرۆكەی دانانی ئەم كتێبە.

(٢) الزمر: ٥٣-٥٥.

واتـە: (ئـەی موحەممـەد! بەنـاوی منـەوە بەندەکانـم بانـگ بکـەو) بڵـێ: ئـەی ئـەو بەندانـەم کـە سـەبارەت بـە خۆتـان سـنوور بەزێنییتـان کـردوە! لـە بەزەیـی خـوا نائومێـد مەبـن، بێگومـان خـوا لـە تێکـڕای گوناحـان دەبـووڕێ، چونکـە بێگومـان هـەر ئـەوە لێبـوردەی بەخشـندە.

بـەرەو لای پـەروەردگاری خۆشـتان بگەڕێنـەوەو گـەردن کـەچ بـن، بـەر لـەوەی ئـازار ی (دۆزەخ)تـان بـۆ بـێ، پاشـان پشـتیوانییتان لـێ نەکـرێ.

بشـکەونە شـوێن چاکتریـن ئـەوەی کـە لـە پەروەردگارتانـەوە بۆتـان نێرراوەتـە خـوارێ، بەرلـەوەی کتوپـڕ ئـازاری (دۆزەخ)تـان بـۆ بـێ، بێئـەوەی هەسـتی پـێ بکـەن).

ئنجا ئێستا با سـەرنجی ئـەم سـێ ئایەتـە بەهێزو پێزە بدەیـن، داخـۆ لـە بـارەی تۆبەکـردن و بـەرەو خـوای بەخشـەرو دادگـەر گەڕانـەوە، چییـان تێدایـە!

**یەکەم:** جارێ ئایەتی یەکەم کە زۆر لە توێژەرەوان (مفسرین) بە ئومێد بەخشترین ئایەت (أرجى آية)ی قورئانیان، داناوەو منیش قەناعەتم وایە کە بە تەئکیدی هەروایە، ئەم بەرەکەت و ڕۆشنایی و فەرەحناییانەی بۆ گوناحباران گرتووتە نێو خۆی:

١- کە لە وشەی: (قُل) وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوای بەخشندە، پێغەمبەری خۆی (صلى الله عليه وسلم) ڕاسپاردوە کە بۆی بانگی بەندە گوناحبارەکانی بکا، چونکە دەزانن کە پێغەمبەرێك (صلى الله عليه وسلم) بە دەقی قورئان بە:

﴿... رَحۡمَةً لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾[1]، و بـە: ﴿... رَءُوفٌ رَّحِيمٌ﴾[2]، وەسـف کرابـێ و بـەرەو: ﴿... أَرۡحَمُ ٱلرَّٰحِمِينَ﴾[3]، یـش بانگیـان بـکا، ئـەوە بەخشـران و چاوپۆشـیی لـێ کرانیـان مسـۆگەرەو، با بێخـەم بـن و خاترجـەم بـن!

---

(١) الأنبياء:١٠٧.

(٢) التوبة: ١٢٨.

(٣) يوسف: ٩٢.

٢- کە لە وشەی: (یاعبادي) وەردەگیرێ، ئەوەیە کە خوای بە بەزەیی بە نازناوی (بەندەکانم) دواندوونی، کە بێگومان بۆ مەدحە، پاشان پاڵیداونە لای خۆی، وەك ئەوەی بفەرمویٚ: هەرچەندە بەندەی لاسارو خراپیش بن، بەڵام مادام هی خۆمن، ئەگەر بگەڕێنەوە لام هەر پێتان ڕازییم!

ئەم وشەیە ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەر خوا (صلی الله علیه وسلم) دێنێتەوە یاد کە فەرموویەتی {عـن أَنَـسٍ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ، قَـالَ: قَـالَ رَسُـولُ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ: أَللَّـهُ أَفْـرَحُ بِتَوْبَـةِ عَبْـدِهِ مِـنْ أَحَدِكُـمْ سَـقَطَ عَـلَى بَعِـيرِهِ وَقَـدْ أَضَلَّـهُ فِي أَرْضٍ فَـلَاةٍ} (١)، واتـە: (بێگومـان خـوا بـە گـەڕانـەوەی بەندەکـەی بـۆلای شـادمان تـرە لـە یەکێکتـان کـە لـە کاتێکدا لـە دەشـت و بیابانێکـی چـۆڵ و دوورە دەسـتدا حوشـترەکەی بـزر کـردوە، لـە نـەکاو دەیدۆزێتـەوە).

٣- کە لە وشەی: (أسرفُوا) دەفامرێتەوە، ئەوەیە کە ئەو بەندە گوناحکارو خەتابارانەی، خوا بانگیان دەکا بۆ تۆبەکردن و گەڕانەوە لای خوا، تەنیا گوناحکارو تاوانبارێکی ئاسایی نین! بەڵکو هەموو سنوورێکی گوناح و تاوانیان بەزاندوە، چونکە وشەی (إسراف) وەك (راغب الأصفهاني) گوتویەتی (٢)، بریتیە لە: (تجاوزُ الحدّ في كل فعل يفعله الإنسان، وإن كان ذلك في الإنفاق أشهر)، تێپەڕاندن لە سنوور لە هەرکردەوەیەکدا کە ئینسان ئەنجامی دەدا، هەرچەندە لە ماڵ و سامان خەرج کرندندا باوترە.

کەواتـە: بـا ئـەو بەنـدە و گوناحکارانـە، هـەر کەسـێکی هـەن و، هـەر گونـاح و تاوانێکیـان هەیـە، بێ هیـوا نەبـن و، مەترسیی ئەوەیـان نەبێ کـە لێبـوردن و بەزەیـی خـوا نایانگرێتـەوە.

٤- کە لە وشەی: (علی أنفسهم) دەفامرێتەوە، ئەوەیە کە خوای کەرەم و لوتف بێ سنوور، ئاماژەی فەرمووە بەوە کە گوناح و هەڵەکان، خوا بۆیە پێی ناخۆشە بەندە توخنیان بکەوێ، چونکە وەك تفی بەرەو سەرێ هەر بۆ خۆیان دەگەڕێتەوەو، بەکورتیی: خوا لەبەر خۆیان پێی ناخۆشە گوناح بکەن، نەك لەبەر خۆی.

---

(١) أخرجه أحمد: ١٨٥١٥، ومسلم: ٢٧٤٦، والحاكم: ٧٦١١.

(٢) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص(٤٠٧، ٤٠٨).

٥- کە لە ڕستەی: (لا تقنطوا من رحمة الله) وەردەگیرێ، ئەوەیە کە بێ هیوا بوون و تەمابڕاو بوون لە بەزەیی و کەرەمی خوا، قەدەغەیە، بۆیە خوا (نهي)یان لێ دەکا، دیارە (نهي)یش لە ئەسڵدا نیشانەی قەدەغە بوون و حەرامییەو، ئاشکراشە کە (نهي) لە هەر شتێك، فەرمان (أمر)ە بە پێچەوانەو دژەکەی، کە لێرەدا ئومێدەواریی و بە تەمابوونە.

٦- کە لە ڕستەی: (إن الله يغفر الذنوب جميعاً) دەفامرێتەوە، ئەوەیە کە ئەم تەعبیرە هەرچی ڕەگەز (جنس)و جۆری گوناح و تاوانە دەیگرێتەوە، چونکە هەم ئەلیف و لام (أل)ی سەر (ذنوب) بۆ ناساندنی (جنس)ە، هەم وشەی (جميعاً)یش یەکجاریی گەسك لە هەرچی گوناح و هەڵەو پەڵەیە دەدا، پێشتریش ئامرازی (إن) کە بۆ داکۆکیی و جەخت لەسەر کردن (تأكيد)ە، لێبوردن و بەخشینەکە مسۆگەر دەکا!

٧- کە ڕستەی: (إنه هو الغفور الرحيم) دەیگەیەنێ، ئەوەیە بە چەندان شێوەی جەختکردن خوا داکۆکیی کردوە کە بەس ئەوە لێبوردەو بەخشندەیە، چونکە هەم (إنّ) کە ئامرازی داکۆکیی (أداة التأكيد)یەو، هەم ڕاناوی (هُو) کە بۆ جەخت لەسەرکردن و کورت هەڵهێنان (حصر)ەو، هەم وشەکانی (غفور و رحيم) کە هەردووکیان بە شێوەی ڕێژگەی زێدەڕۆیی (صيغة المبالغة) هاتوون و لە ئەسڵدا (غافر و راحم)ن، سەرجەمیان حەتمیەتی لێبوردنی خواو بەزەیی و بەخشندەیی نواندنی دەگەیەنن.

**دووەم:** ئایەتی دووەمیش بریتیە لە فەرمانکردن بە گەڕانەوە بەرەو پەروەردگار، وشەی (إنابة) هەرچەندە بە مانای گەڕانەوە دێ، بەڵام زیاتر گەڕانەوەی دەروونیی و لە ناخەوە دەگرێتەوە، دیارەوشەی (إسلام)یش زیاتر ڕواڵەت دەگرێتەوە، بە تایبەت کە لێرەدا لەگەڵ (إنابة)دا هاتوە، ئەگەرنا هەم (إنابة)و هەم (إسلام)یش، ئەگەر بە موتڵەقیی و بە تەنیا بێن، ڕواڵەت و پەنهان (ظاهر و باطن) دەگرنەوە.

کەواتە: ئەم ئایەتە چۆنیەتی و جەوهەری تۆبەو گەڕانەوە لای خوامان بۆ دەردەخا، کە بریتیە لە گەڕانەوە بە دڵ و جەستەو پەنهان و ڕواڵەت و دەروون و دەرەوە، بۆ لای خوا جل جلالە.

پاشـان ترسـی مـەرگ و[١]، قیامـەت و دوارِۆژ دەخاتـە بەرچـاوی بابـای گوناحبـار، تاکـو هەرچـی زووتـر پەلـە بـکاو، دەسـت لـە گـەرِانەوەکـەی بجووڵێنـێ و، بـە خەیـاڵ پـڵاوو شـتی پـووچ و بێجـێ نەیوەخرێنـێ[٢].

**سێیەم:** سەرەنجام لە ئایەتی سێیەمیشدا خوای پەروەردگار رِێبازو شێوازی بەرەو خوا گەرِانەوەو لەگەڵ خوا ئاشت بوونەوەو بەرەو طاعات چوونەوە، دەخاتە بەر چاوی بابای تۆبەکار، کە بریتیە لە پەیرِەوییکردن و شوێنکەوتنی کتێبی خوا، چونکە ئینسان ئەگەر بەرچاوی روون نەبێ، چۆن چۆنی و بەکوێدا بەرەو خواو رەزامەندیی خوا بچێ!! هەرچەندە دڵگەرمانەو دڵسۆزانەش لێ بخەفتێ، بەڵام بێ شارەزایی سەرەنجام سەری لێ تێکدەچێ. کەواتە: ئەم سێ ئایەتە هەرسێك پێکهێنەرە بنچینەییەکان (المكوِّنات الثلاثة الأساسية)ی تۆبـەو بەرەو خوا گەرِانەوەیان خستوونە روو، کە بریتین لە:

**یەك:** بانگکردنی پرِ لوتف و خۆشەویستیی و بەزەیی و هاندان و، رِێ بۆ خۆشکردن و تەماعی لێبووردن و بەخشین خستنە بەر، بە شێوازێکی یەکجار دڵنیارکەرو جەخت لەسەرکراو و بیانوو برِ و[٣]، لێ قەدەغەکردنی نا ئومێدیی و بێ هیوایی.

**دوو:** فەرمان پێکردن بە گەرِانەوەیەکی رِاست و ساغ و، روونکردنەوەی جەوهەرو کاکڵی (تۆبە)، واتە لە ئایەتی پێشوودا بانگ کراون و دەعوەت کراون و رِاچڵەکێنراون و هاندراون، لەم ئایەتەشدا ئەسڵی مەبەستیان لێ حاڵی کراوەو فەرمانیشیان پێکراوە،

---

(١) دەشگونجێ مەبەست لە (عذاب) ئازارو سزاو تۆڵەی دنیایی بێ.

(٢) نەیوەخرێنێ: دوای نەخا،وەخراندن: دواخستن (تأخير).

(٣) ١- (ابـن حاتـم و ابـن مردويـه) لـە (أبـي سـعد)ەوە گێرِاویانەتـەوە کـە دوای ئـەوەی (وحشي) مسوڵمان بوو، کە پێشتر لە جەنگی (ئوحود)دا (حمزة بن عبدالمطلب)ی مامی پێغەمبەری خوای (صلى الله عليه وسلم) شەهید کردبوو، کە نازناوی (سيد الشهداء)ی هەیە، خوای بەرز ئایەتی (٦٨)ی (الفرقان)ی ناردە خوارێ، وەحشیی و هاوەڵەکانی گوتیان: ئێمە ئەم گوناحانەمان هەمـوو کـردووە، پاشان خوا: ﴿قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ ...﴾ (الزمر :٥٣)ی ناردە خوارێ و، قەناعەتیان هات کە خوا لێیان خۆش دەبێ، برِوانە: (فتح القدير الجامع بين فني الرواية و الدراية من علم التفسير) للشوكاني، ج٤، ص ٥٦٨.

بگرە هەڕەشەشیان لێکراوەو ترسیشیان وەبەرنراوە، ئەگەر بێت و فەرمانی خوا جێبەجێ نەکەن و، بە دەنگییەوە نەچن و دەعوەت و بانگهێشتەکەی قبووڵ نەکەن!

چ کەرەم و بەزەیی و بەخششێکی عەجایەب و نەدیتراو و نەبیستراو و نەزانراو!! بانگـردن و دەعوەتکـردن لـە ڕێـی نوێنەرێکـی بەرجەسـتەی بەزەیـی خـوا (رحمـة للعلمیـن)ەوە، پاشـان قەدەغەکردنـی نەهاتـن و دەعـوەت قبـووڵ نەکـردن، ئنجـا لەسـەر فەرزکردنـی دەعـوەت قبووڵکـردن و بەدەنگـەوە هاتـن!! ئەمـەش هەمـووی بۆچـی؟! تاکـو لێیـان خۆش بـێ و، بەزەییـان لەگـەڵ بنوێنـێ و، بیانخاتـە بەهەشـتی خۆیـەوە!

**سێ:** دیارییکردن و پێشاندانی ڕێبازو چۆنیەتی و شێوازی ئەو گەڕانەوەو بادانەوەیە بەرەو خوا، کە شوێنکەوتن و پابەندییە بە قورئانەوە، کە چاکترین و گەورەترین کتێبی هاتوە خوارەوەی خوای کاربەجێ و دادگەرو بەخشەرە.

بەڵـێ خـوای لێبـوردەو بەخشـەر -تبـارك و تعالـی- پـاش بانگکردنـی بەنـدە گوناحبارەکانـی، کـە هەمـوو جـۆرە بەندەکانـی خـوا بەمسـوڵمان و نـا مسـوڵمانەوە دەگرێتـەوەو، فەرمانپێکرنـدن و داکۆکیـی لەسـەر کردنیـان کـە حەتمـەن دەبـێ بـە دەنگیـەوە بێـن و، حاڵیـی کردنیشیان لـە مەبەسـت (مقصـود)ی ئـەو بانگهێشـتکردنە، ئـەو جـار ڕێـگاو چۆنیەتـی چـوون و گەیشـتنی پێشـان داون! واتـە: لـەم سـێ ئایەتـە بەهێـزو پێـزەدا، سـێ پـەرچ (مانـع)ی گـەورەی سـەر ڕێـی بـەرەو لای خـوا گەڕانـەوە لابـراون و، سـێ گرفتـی گـورچکبـڕی بابـای تۆبـەکار چارەسـەرکراون، کـە بریتیـن لـە:

١- دەست لە خۆ شۆردن و نائومێدبوون لە بەزەیی و بەخششی خواو، زۆر خۆ پێ خراپ و پیس بوون، کە بە هیچ ڕەنگێك خوا نایبەخشێ! ئنجا ئەم گرفتە گەورەیە بە ئایەتی:

﴿ قُلْ يَـٰعِبَادِىَ ٱلَّذِينَ أَسْرَفُوا۟ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمْ لَا تَقْنَطُوا۟ مِن رَّحْمَةِ ٱللَّهِ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغْفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًا ۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾[1]، چارەسەرکراوە.

---

(١) الزمر:٥٣.

**٢-** بە هەڵەداچوون لە چەمك و واتاو جەوهەری تۆبەکردندا، یان هەر پێ ئاشنا نەبوونی، کە زۆر کەس پێی وایە گەڕانەوە لای خوا، تەنیا شتێکی ڕواڵەتییەو بە گوتنی چەند جارێك (أستغفر الله) مەداری ساز دەبێ! ئنجا ئایەتی:

﴿ وَأَنِيبُوٓاْ إِلَىٰ رَبِّكُمۡ وَأَسۡلِمُواْ لَهُۥ مِن قَبۡلِ أَن يَأۡتِيَكُمُ ٱلۡعَذَابُ ثُمَّ لَا تُنصَرُونَ ﴾[١]

ئـەو پەرچەشـی لابـردوەو، گرفتـی ئـەو بـە هەڵەداچوونەشـی چارەسـەکردوەو، ڕایگەیانـدوە کـە (تۆبـە) وەرچەرخـان (إنعطـاف) و گۆڕانکارییەکـی ڕیشـەیی و قووڵـە، کـە هـەرکام لـە دەروون و دەر (باطـن و ظاهـر)ی ئینسـان دەگرێتەوەو..هتـد.

**٣-** بە ڕێگا نەزانین و ئاشناو شارەزا نەبوون لە قۆناغی دوای گەڕانەوە، کە پێویستە چی و چۆن بکرێ و، چ ئەرکێك ئەنجام بدرێ؟ کە بە ڕاستیی ئەم گرفت و پەرچەش یەکجار مەترسییدارو زیان بەخشە، چونکە دەبینی بابای سەرپێچییکارو گوناهبار، گەڕاوەتەوە لای خواو بڕیاری داوە بەندەی چاك و پاك بێ، بەڵام لە سۆنگەی ئەوەوە کە تۆبەو بڕیارەکەی لە حاڵەتێکی دەروونیی و هەڵوێستێکی عاتیفییانە بەولاوە نیە، هیچ گۆڕانکاریی و وەرچەرخانێکی ئەو تۆی تێدا پەیدا نابێ و، بگرە جاری وایە لەبەر بێ زانستیی و نەشارەزایی، ڕوو لە شتی هەڵەو جۆرە مسوڵمانەتییەکی داهێنراو (تديُّن مبتدع)یش دەکات و، ئەم حاڵەتە نەخۆشییەش، کە بریتیە لە دینداریی کردنی دڵگەرمانەو عاتیفییانەی دوور لە شارەزایی شەرعیی، لە نێوان سەرجەم چین و توێژە ئیسلامییەکاندا هەیە، چ ئەهلی تەصەووف و سەلەفیی ناوو، چ کۆمەڵ و لایەنە ئیسلامییەکانیش و، چ خەڵکی عەوام بەگشتیی، ئنجا ئایەتی:

﴿ وَٱتَّبِعُوٓاْ أَحۡسَنَ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُم ... ﴾[٢].

---

(١) الزمر: ٥٤.

(٢) الزمر:٥٥.

چارەسەری ئەو گرفتە کوشندەیەو ئەو پەرچ و کۆسپە ڕێگرە دەکات و لای دەبات و، یەکسەر پاش (تۆبەکردن) ڕوو بە بابای تۆبەکار دەکاتە، شارەزایی لە قورئان و زانستە شەرعییەکان، تاکو گەڕانەوەکەی تەنیا سۆزو عاتیفەو هەڵچوونێکی کاتیی نەبێ.

لە کۆتایی ئەم پێشەکییەشدا دەڵێم: خوای کاربەجێ کە مرۆڤی لەم سەر خڕۆکەی زەوییە بە مەبەستی تاقیکردنەوە داناوە:

﴿ ٱلَّذِى خَلَقَ ٱلْمَوْتَ وَٱلْحَيَوٰةَ لِيَبْلُوَكُمْ أَيُّكُمْ أَحْسَنُ عَمَلًا ۚ وَهُوَ ٱلْعَزِيزُ ٱلْغَفُورُ ﴾[1].

سروشتی ئیسنانی وا هەڵخستوە، کە بە بێ بەندایەتیی بۆ خواکردن و پەیوەندیی لەگەڵ هەبوونی، ئارام نەگرێ و ئۆخژنی بۆ نەیەت و بەختەوەر نەبێ.

بۆیە گەڕانەوە بۆ لای خواو بەندایەتیی بۆ کردنی و پەرستنی، مەرجی بنەڕەتیی و ڕیشەیی سەرفرازیی و بە مرادو مەبەست گەیشتنی ئینسانەو، بە بێ ئەوە، ژینتاڵ و شپرزە حاڵ و بێ بەش و سەربەهەش دەبێ!

خوای بەخشندەی بە بەزەیی فەرموویەتی: ﴿ وَتُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾[2].

واتە:... ئەی بڕوادارینە! تێکڕا بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بەڵکو بەمراد بگەن، (راغب) گوتوویەتی: (الفلح: الشقُّ، و الفلاّح: الأكّارُ، والفَلَاحُ: الظفر و إدراك البغية..) پاشان (فلاح)ی دواڕۆژ بە چوار شتان پێناسە دەکات: (بقاء بلا فناء، و غنى بلا فقر، و عز بلا ذلّ، و علم بلا جهل)، واتە: مانەوەی بێ فەوتان و، دەوڵەمەندیی بێ نەداریی و، زاڵبوویی بێ زەبوونیی و، زانیاریی بێ نەزانیی[3].

---

(١) الملك:٢.

(٢) النور:٣١

(٣) مفردات ألفاظ القرآن، ص ٤٦٦.

بەڵێ تەنها ڕێی بە مرادو مەبەست گەیشتنی ئینسانەکان، بۆ لای خوا - تبارك و تعالـی - گەڕانەوەیانە، ئنجا لە سۆنگەی ئەوەوە کە خوای پەروەردگاری بەخشەرو دادگەر، بە تەنگ بەندەکانیەوەیەو، بەزەیی پێیاندا دێتەوەو پەرۆشنی، لەو هەمـوو ئایەتانەی قورئانـداو، هێنـدە بـە جەخت و داکۆکیـی لەسـەرکردنەوە، سـەرەڕای فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەری خـوا (صلـی اللـه علیـه وسـلم)، بانگـی بەندەکانـی کـردووەو دڵـی خـۆش کـردوون و هانـی داون و، بگـرە هەندێـك ترسـی وەبەرنـان و هەڕەشەشـی لـێ کـردوون، کـە هەرچـی زووە بگەڕێنـەوە لای و بێنـەوە ژێر سایەی فـەڕو بەرەکەتی بەندایەتیی بۆ کردنی و، لـە بیابانی قاقڕو فەوتێنـەری گونـاح و سـەرپێچیی و لادان و تـاوان خۆیـان قوتـار بکـەن!

## ڕێ خۆشکردن

خوێنەری بەڕێز!

ئەم کتێبەی بەردەستت لە حەوت بەشان پێکهاتوە و، بابەت و باسەکانی بەم جۆرەی خوارەوە ڕیزکراون:

**بەشی یەکەم:** پێناسەی (توبة)، کە لە دوو خاڵدا پێناسەمان کردوە، لە خاڵی یەکەمدا لە ڕوانگەی زمانەوەو، لە خاڵی دووەمیشدا لە ڕوانگەی شەرع و شەرعزانان (فقهاء)ەوە.

دیارە هەرکام لە وشەکانی (الإنابة) و (الأَوْبة) و (الإستغفار)یشم بە کورتیی پێناسەکردوون.

**بەشی دووەم:** حوکمی تۆبەو گەڕانەوە لای خوا، کە ئەمیشیانمان لە چوار خاڵاندا خستۆتە ڕوو کە ئەمانەن:

**یەك:** تۆبە فەڕزی عەینە.

**دوو:** پێویستە تۆبە گشتگیر (شامل) بێ.

**سێ:** دەبێ بەردەوام نەپساو بێ.

**چوار:** پێویستە دەستبەجێ و زوو بە زوو بێ.

**بەشی سێیەم:** چۆنیەتی تۆبەکردن و پێناسەی تۆبەی ڕاست و ساغ (التوبة النصوح)، کە چەند تێبینییەکی گرنگمان لە بارەی چۆنیەتی تۆبەکردنەوە خستوونە ڕوو و، پێناسەیەکی پوخت و کورتی تۆبەی ڕاست و ساغیشمان کردوە.

**بەشی چوارەم:** مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ و هۆکارو فاکتەرەکانی سەرگرتنی، لە تەوەری یەکەم دا دوازدە (١٢) مەرجی گەورەو گرنگمان، خستوونە ڕوو، کە لە هەمان کاتدا بەڵگەو نیشانەشن، بۆ تۆبەی ڕاست و ساغ و وەرگیرانی و، لە تەوەری دوومیش دا حەوت (٧) مەرجی سەرو بەرگرتنی گەڕانەوە لای خوامان خستونەتەڕوو، ئەم بەشە بەشێکی زۆر گرنگی ئەم کتێبەیەو، پێویستە بایەخێکی تایبەتیی پێ بدرێ.

**بەشی پێنجەم:** تۆبە لە چی و چی دەکرێ؟!

لەم بەشەشدا لە سێ خاڵی سەرەکییدا، هەم ناوی گوناح و تاوانەکان (ناوە گشتییەکانیان)و، هەم پێناسەی هەرکام لە گوناحی زل (الكبيرة)و، گوناحی بچووك (الصغيرة)و، هەم ئەو هۆیانەی کە حوکمی گوناحە گچکەکان دەگۆڕن بۆ هی گەورە، تویژراونەوە.

**بەشی شەشەم:** شوێنەواری خراپ و شووم و زیانی گوناح و تاوان بۆ تاك و کۆمەڵ.

لەم بەشەشدا لە دوو خاڵی گشتییدا، باسی شوێنەوارە شووم و زیان و زەرەکانی گوناح و تاوان دەکەین، لە خاڵی یەکەمدا ڕۆڵی خراپەکارانەی گوناح و لادان لە ژیانی تاکداو، پاشان کاریگەریی شووم و نەگبەتانەی، سەرپێچیی و تاوان لە ژیان و گوزەرانی کۆمەڵگادا دەخەینە ڕوو.

هەرچەندە زەرو زیان و شووم و نەگبەتیی خراپەو تاوان، بە شێوەی ڕاستەقینەی تەنها لە قیامەت و دوارۆژدا ئاشکرا دەبێ.

**بەشی حەوتەم:** بەرهەم و شوێنەواری گەڕانەوە لای خوا، لە سڕینەوەی گوناح و چاککردنی ئینساندا.

ئەم بەشە کە بەشی کۆتایی ئەم کتێبەیە، گەورەترین و گرنگترین بەشیەتی، چ لە ڕووی قەبارەو پانتایی بۆ تەرخانکراوی و، چ لە ڕووی گرنگیی و بایەخ و جەوهەرو کاکڵی باس و بابەتەکانیەوە.

ئەم بەشە بەگشتیی لە دوو تەوەر پێك هاتوە:

**تەوەری یەكەم:** كاریگەریی و شوێنەواری تۆبە لە سڕینەوەو لابردنی گوناحدا.

**تەوەری دووەم:** كاریگەریی و بەرهەمی گەڕانەوە لای خوا لە چاككردنی ئینساندا.

پاشان بە (دوا قسەم) كۆتایی بەم كتێبە هێنراوە، كە لە خوای پەروەردگارم داواكارم پێش خوێنەرە خۆشەویستەكان، خۆمی لێ بەهرەمەند كردبێ و بكات و، یارمەتیی هەموو لایەكمان بدا، كە بەهۆی هەمیشە گەڕانەوە لای و داوای لێبوردن كردنییەوە، ئەم ژیانە كورت و بایەخدارەی ئەم سەرزەوییەمان مسوڵمانانەو پارێزكارانە بگوزەرێنین و، بتوانین لەولا كە مەنزڵگای ڕاستەقینەمانە، ڕەزامەندیی خواو بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی وەدەست بێنین.




# پێناسەی (تَوبَة)

# گەڕانەوە بۆ لای خوا

١- لە ڕوانگەی زمانەوە.

٢- لە ڕوانگەی شەرعەوە.

## خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشە لە دوو تەوەردا دەخەینەڕوو:

## تەوەری یەکەم:

## پێناسەی (توبة) گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە ڕوانگەی زمانەوە

وشـەی (تَوْبـة) و (تَـوْب) یانـی گەڕانـەوە (الرُجـوع)، وەك (عَزْمـة) و (عَـزْم)، ڕستەی (تـاب إلــى الله متاباً) واتـە: گەڕایەوە بۆ لای خواو لـە گوناهـەوە گەڕایەوە بۆ فەرمانبەریـی[1]، بەڕای (الأخفـش) وشـەی (تَـوب) کـۆی (توبة)یـە، بـەڵام (المبرّد) بـە چـاوگ (مصـدر)ی دادەنـێ، هەروەهـا لـە ڕایەکیشیدا بـە کـۆ (جمـع)ی دادەنـێ، وەك (كَـوْز) کـە کـۆی (كَوْزة)یـە.

(أبـو منصـور) گوتوویەتـی: (أَصْـلُ تـاب، عـاد إلــى اللـه و رَجَـعَ و أنـابَ، و منـه قولـهُ عليـه الصلاة و السـلام: (رَبّ تقبـل تَوبتـيْ و اغسـلْ حَوْبَتـي)[2] ، و تـابَ اللـه عـلى فـلانٍ، أي عـاد عليـه بالمغفـرةِ).

واتـە: ڕیشـەی (تـاب) یانـی: گەڕایـەوە لای خواو پەشـێمان بـووەوە، وەك پێغەمبەر (صلى الله عليـه وسـلم) فەرموویەتـی: (پـەروەردگارم! گەڕانـەوەم قبـووڵ بکـەو

---

(١) بڕوانە سەرجەم فەرهەنگەکانی زمان کە لەو بارەوە کۆکن، بە تایبەت (لسان العرب ج١، ص ٢٣٣، و (المعجم الوسيط) ص٩٠، و (مختار الصحاح)، ص٨٠، و (مفردات ألفاظ القرآن)، ص١٨٩.

(٢) أخرجه الترمذي في سننه: ٣٦٢١، و قال: حديث حسن صحيح.

گوناهـم بشـۆ)، ڕسـتەی: (تـاب اللـه علـى فـلان) یانـی: خـوا بـە لێبوردنـەوە گەڕایـەوە سـەری.

هەروەها پسپۆڕانی زمان گوتوویانە:

وشـەی (تَوْبَـة) خـوای پەروەردگارو بەنـدە تێیـدا بەشدارن، ئنجا ئەگەر پاڵدرایـە لای بەنـدە، ئـەوە مانـای گەڕانـەوە لای خـواو واز لـە سـەرپێچیی (مَعْصيـة) هێنـان و فەرمانبەریـی (طاعـة) دەگەیەنـێ و، ئەگـەر پـاڵ درایـە لای خـواش، ئـەوە گەڕانـەوەی خوا بۆ لای بەندەکەی، بە بەزەیی و چاکەو لێبوردنییەوە، دەگەیەنـێ.

هەروەهـا کـە خـوای لێبـوردە بـە (تـوّاب)، وەسـف کـراوە، مەبەسـت زۆر لێبوردنی خواو، زۆر تۆبە وەرگرتنی لە بەندەکانی و، زۆر گەڕانەوەی و چاکەو چاوپۆشییەتی لەگەڵیاندا.

هـۆی وەسـف کرانـی بەنـدەش بـە (تـوّاب)، ئـەوەیە کـە زۆر بـۆ لای خوا دەگەڕێتەوەو، زۆر لە هەڵەو گوناح پەشێمان دەبێتەوەو، بۆ فەرمانبەریی (طاعة) دەگەڕێتەوە.

**تەوەری دووەم:**

## پێناسەی گەڕانەوە بۆ لای خوا (تَوْبة) لە ڕوانگەی شـەرعەوە

گەڕانەوە بۆ لای خوا (التوبة إلى الله) لە ڕوانگەی شەرعەوە، بریتیە لە:

(دڵتەنگ بوون و پەشێمان بوونەوە لە هەڵەو گوناحەکان لەبەر خواو، دەست لێ هەڵگرتنیان و، بڕیاردان و عەزم و جەزم کردن لەسەر نەگەڕانەوە سەریان و، هەوڵدان بۆ پڕکردنەوەو قەرەبووکردنەوەی کەلێنی ڕابردوو، هەمووئەمانەش بە هاندەری لە خواترسان و شەرم لێکردنی و لەخۆ ڕازیی کردنی و، دڵنیابوون لە زەرەرو زیانی گوناح و سەرپێچییەکان و، سوودو قازانجی طاعەت و چاکەکان).

١- (ابن جرير الطبري) لەپێناسەی (توبة)دا گوتوویەتی: (معنى التوبة من العبد إلى ربه: إنابته إلى طاعته و أوبته إلى ما يرضيه، بتركه ما يسخطه، من الأُمور التي كان عليها مقيماً مِمّا يكرهه ربُّهُ) [1]، واتە: مانای گەڕانەوەی بەندە بۆ لای پەروەردگاری، بادانەوەیەتی بەرەو فەرمانبەریی وی و، گەڕانەوەیەتی بەرەو ئەو شتانەی پێیان ڕازی دەبێ، بەهۆی وازهێنان و دەست هەڵگرتنی لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆش بوون و، ئەویش ئەنجامی داون.

٢- (القرطبي)یش ئاوا پێناسەی (توبة)ی کردوە[2]: (هي الندم بالقلب، و ترك المعصية في الحال، و العزم على أن لا يعود إلى مثلها، و أن يكون ذلك حياءً من الله) [3]، واتە:

---

(١) بڕوانە: (تفسير الطبري) ج١، ص ١٩٥.

(٢) بڕوانە: (تفسير القرطبي) ج٥، ص٩١.

(٣) بڕوانە: (تفسير ابن كثير) ج٤، ص٣٩٢.

(توبة) بريتيە لەوەی بە دڵ پەشێمان ببێتەوە، دەستبەجێ واز لە سەرپێچیی بێنێ و، دڵیشی لەسەر ئەوە چەسپاو بێ کە نەچێتەوە سەری و، بەهاندەری شەرم لە خواش بێ.

٣- (ابن کثیـر)یش لە پێناسەی (تَوْبة)دا گوتوویەتی: (التوبة النصوح هو أن يُقْلِعَ عن الذنب في الحاضر، و يَنْدَم على ما سلف منه فـي الماضي، و يَعْزِمَ على أن لا يفعل في المستقبل، ثم إن كان عليه الحق لآدمي رده إليه بطريقه) [١]، واتە: تۆبەی نەصووح ئەوەیە کە ئێستا دەستبەجێ واز لە گوناحەکان بێنێ و، بۆ ئەوەش کە ڕابردوە پەشێمان بێ و، بڕیاری پتەویش بدا کە لە داهاتوودا نەیکا، ئنجا ئەگەر مافی کەسێکیشی لەسەر بوو، بە شێوازی خۆی بۆی بگێڕێتەوە.

٤- (راغب الأصفهاني)یش لەوبارەوە گوتوویەتی: (التوبة ترك الذنب لقبحه، والندم على ما فرط منه، والعزيمة على ترك المعاودة، و تدارك ما أمكنه أن يُتدارك من الأعمال بالإعادة) [٢]، واتە: تۆبە واز لە گوناح هێنانە لەبەر خراپیی و، پەشێمانبوونەوە لەوەی کە لە دەستی چووەو، دڵ دامەزراندن لەسەر نەگەڕانەوەو چاککردن و، گێڕانەوەی ئەو کردەوانەش کە فریایان دەکەوێ.

٥- (الغزالي)یش لە پێناسەی تۆبەدا گوتوویەتی: (إنها عبارة عن معنى ينظم في ثلاثة أمور مرتبة: علم و حال و عمل، فالعلم هو معرفة الذنوب و عِظَمُ خَطَرِها، و الحال هو تألُّم النفس من ذلك الضرر، و هو ما يسمى بالندم، والعمل هو ترك الذنب و تدارك ما يمكن تداركه في المستقبل) [٣]، واتە: تۆبە بریتیە لە چەمك و مەبەستێك کە لە سێ شتی بەڕیزدا خۆی دەنوێنێ: زانین و حاڵەت و کردار، ئنجا زانین بریتیە لە ناسینی گوناحەکان و مەترسیی گەورەیان، حاڵەتیش بریتیە لە نارەحەتبوونی نەفس لەو زەرەرو زیانە، کە پەشێمانیی پێ دەگوترێ، کردەوەش بریتیە لە واز لە گوناح هێنان و قەرەبووکردنەوەی ئەوەی دەگونجێ لە داهاتوودا.

---

(١) بڕوانە: (تفسير ابن كثير) ج٤، ص٣٩٢.

(٢) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن).

(٣) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٤، ص٣.

٦- (إبن القيم)یش لایەنێکی گەورەو گرنگی تۆبە دەستنیشان دەکا کە گوتوویەتی:[١] (لايكون الإنسان بمجرد الإقلاع و العزم و النَّدَم تائباً، حتى يوجد منه العزم الجازم على فعل المأمور و الإتيان به، وهذا حقيقة التوبة، وهي اسم لمجموع الأَمرين..)، واتە: ئینسان تەنیا بەوەندە کە واز لە گوناح و سەرپێچیی دێنێ و بڕیار دەدا کە نەیکاو پەشێمان دەبێتەوە، نابێتە تۆبەکار (تائب)، هەتا بڕیاری پتەویش نەدات، بۆ کردن و ئەنجامدانی چاکەو طاعەت، ئەمە جەوهەری تۆبەیەو، تۆبە بە کۆی هەردووکیان (واتە نەبوونی سەرپێچیی و هەبوونی فەرمانبەریی ) دەگوترێ.

دیـارە ئـەم تێبینییـەی (إبـن قیـم الجوزیـة)ش لـە جێـی خـۆی دایـە، چونکـە زۆر کـەس پێـی وایـە کـە تۆبـە تەنیـا گونـاح نەکـردن و تـووش نەبوونـەوەی هەڵـەو خراپەکانـە! بـەڵام بێگومـان بـەر لـەوە، تۆبـە کـردن گەڕانەوەیـە بـۆ لای خـوا بـە طاعەتـەوەو، بڕیاردانـە بـۆ جێبەجێکردنـی ئـەرك و فەرمانـەکان.

شـایانی باسـە کـە هـەرکام لـە وشـەکانی: (الأَوْبـة) و (الإنابـة)ش لـەلای زۆربـەی پسـپۆڕانی زمـان و شـەرعزانان، هەمـان چەمـك و واتـای (توبة)یـان هەیـە، کـە گەڕانەوەیـە[٢]، ئەوەنـدە هەیـە هەندێـك لـە زانـاو شـارەزایان ڕایـان وایـە کـە ئـەو دوو وشـانە، وێـڕای گەڕانـەوە (الرجوع) مانـای دیکـەی زیادیـش دەگەیەنـن، بـۆ وێنـە (أبـو هـلال العسـكري)[٣]، ڕای وایـە کـە وشـەی: (إيـاب و أوبـة) بـە مانـای گەڕانـەوە دێ بۆ کۆتایـی مەبەسـت (الرجـوع إلى منتهـى القصد) و، ئەم ئایەتەش بـە بەڵگە دێنێتەوە: ﴿ إِنَّ إِلَيْنَآ إِيَابَهُمْ ﴾[٤]، چونکـە بێگومـان قیامـەت هیـچ مەنزڵـی دیکـەی لـە پشـتەوە نیـن، بـەڵام ڕاستییەکەی ئەوەیـە کـە ئـەو مانـا زێدەیـەی (أبـو هـلال) ڕەچـاوی کـردوە لـە ئەسـڵی وشـەی (إيـاب)دا نیـەو، نیشـانەی حاڵ (قرينـة الحـال) دەیگەیەنـێ!

---

(١) بڕوانە: (مدارج السالكين) ج١، ص (٣٠٥-٣٠٦).

(٢) بڕوانـە: (لسـان العـرب) ج١، ص(٢١٧-٢١٨)، و (مفـردات: ألفـاظ القـرآن) ص٩٧، و (لسـان العـرب) ج١، ص٧٧٥، و (مفـردات ألفـاظ القـرآن)، ص٨٢٧.

(٣) بڕوانە: (الفروق اللغوية) لأبي هلال العسكري، ص ٢٥٠.

(٤) الغاشية:٢٥.

هەروەهـا (ابـن القيم)یـش دەربـارەی وشـەی (إنابـة) ڕای وایـە کـە لـە وشـەی (توبـة) تایبەتییتـرەو لـە پشـت ئـەوەوە دێ، واتـە: هەمـوو (منیب)ێك (تائِـب)ە، بەڵام هەمـوو (تائِب)ێك (منیـب) نیـە، هەروەها گوتوویەتـی: (إنابـة) دوو جۆرە:

**یەك:** (إنابة) بۆ لای پەروەردگاریێتیی (ربوبیة) خوا، کە ئەمە سەرجەم دروستکراوەکان تێیدا بەشدارن و، بڕوادارو کافرو چاکەکارو خراپەکار تێیدا هاوبەشن، وەك خوای بەرز فەرموویەتی:

﴿وَإِذَا مَسَّ ٱلنَّاسَ ضُرٌّ دَعَوۡاْ رَبَّهُم مُّنِيبِينَ إِلَيۡهِ ثُمَّ إِذَآ أَذَاقَهُم مِّنۡهُ رَحۡمَةً إِذَا فَرِيقٌ مِّنۡهُم بِرَبِّهِمۡ يُشۡرِكُونَ﴾[١].

**دوو:** (إنابة)ی دووەمیش (إنابة)ی دۆستەکانی خوایە، کە (إنابة)یە بۆ لای پەرستراوێتیی (إلهیة)ی خواو، (إنابة)ی بەندایەتیی و خۆشەویستنەو، چوار شتان دەگرێتە نێو خۆی:

١- خۆشەویستیی،

٢- گەردن بۆ کەچکردن،

٣- ڕووتێکردن،

٤- ڕوو لە غەیری وی وەرچەرخاندن، هەروەها تەنیا کەسێك شایستەی ناوی (منیب)ە کە ئەم چوارەی تێدا کۆببوبنەوە.[٢].

منیـش وای بۆ دەچم کە جیاوازیـی نێوان وشـەی (توبـة)و (إنابـة) ئەوەیـە کـە (توبـة) زیاتـر ڕواڵـەت و حاڵەتـی بەرچـاوی گەڕانـەوە بـۆ لای خـواو، (إنابـة)ش دیـوی پەنهـان و شـێردراوەی گەڕانـەوەو، لـە نـاخ و دەروونـەوە گەڕانـەوەی بـۆ لای خـوا دەگەیەنـێ.

---

(١) الروم:٣٣.

(٢) بڕوانە: (مدارج السالكين) ج١، ص (١٣٣-١٣٤).

وشـەی (إسـتغفار)یش کـە بـە مانـای (داوای لێبـوردن کـردن) دێ و، لـە قورئانێدا جار جار لەگـەڵ (توبـة)و، جاورباریش بـە جیا هاتـوە، زیاتـر حاڵەتـی زمانیـی و دەربڕینـی گەڕانـەوە بـۆ لای خوا دەگرێتـەوە، وەك (إبـن قيم الجوزيـة) گوتوویەتـی[1]: (إسـتغفار) لابردنـی زەرەرو زیـان و پاکسـازییە، (توبـة)ش وەدەست هێنانـی قازانـج و بەرژەوەندیـی و چاکسـازییە.



---

(١) سەرچاوەی پێشوو، هەمان بەرگ، ص٣٠٩.




# حوكمی

# گەڕانەوە بۆ لای خوا (توبة)

١- پێویستییەكی تایبەتییە.

٢- پێویستە گشتیر بێ.

٣- دەبێ بەردەوام و نەپساوە بێ.

٤- پێویستە دەستبەجێ و زوو بە زووبێ.

خوێنەری بەڕێز!

ئەم بەشە لە چوار تەوەردا دەخەینەڕوو:

## تەوەری یەك: تۆبە فەڕزی عەینە

گەڕانـەوە بۆ لای خـواو، دەست هەڵگرتـن لـە گونـاح و هەڵەو پەڵەو سـەرپێچیی، لەسـەر هەمـوو مسـوڵمانێکی عاقڵ و باڵغ پێویسـتە بەشێوەی: پێویسـتیی تایبەتیـی (فـرض العیـن)، ئەمـەش چەنـد دەقێکـی قورئانـی خـوای کاربەجـێ و سـوننەتی پێغەمبـەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لـەو بارەوە:

خوای لێبـوردە لـە چەنـدان ئایەتـدا فەرمانـی بـە بەندەکانـی کـردوە، کـە تۆبـە بکـەن و بگەڕێنـەوە بـۆ لای خـوا، بـۆ وێنـە:

١- ﴿ وَتُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ جَمِيعًا أَيُّهَ ٱلْمُؤْمِنُونَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴾[١].

واتە: تێکڕاتان ئەی بڕوادارینە! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا بەڵکو بە مراد بگەن.

٢- ﴿ وَٱسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓاْ إِلَيْهِ ۚ إِنَّ رَبِّى رَحِيمٌ وَدُودٌ ﴾[٢].

واتە: داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە لای، مسۆگەر پەروەردگارم بەخشندەی خۆشویست (مُحِبٌّ)ە.

---

(١) النور:٣١.

(٢) هود:٩٠.

٣- ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ تُوبُوٓا۟ إِلَى ٱللَّهِ تَوْبَةً نَّصُوحًا ﴾[١].

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! بە گەڕانەوەیەکی ساغ بگەڕێنەوە لای خوا.

٤- پێغەمبەری خواش (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: { يَا أَيُّهَا النَّاسُ تُوبُوا إِلَى رَبِّكُمْ، فَإِنِّي أَتُوبُ إِلَيْهِ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ }[٢]، واتە: ئەی خەڵکینە! بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، چونکە من لە ڕۆژێدا سەد جار دەگەڕێمەوە بۆ لای خوا.

ئنجا هەرچەندە هەر مەسەلەیەك بە دەقی ڕاست و ڕاشکاو (نص صحيح و صريح)ی قورئان و سوننەت ئیسپات ببێ، حەوجێی بە هیچ شتێکی دیکە نیە، بەڵام فەرزبوونی تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، بۆ یەك یەکی مسوڵمانان، وێڕای ئەو بەڵگانە، یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء)یشی لەسەرە، بۆ وێنە: (أبو حامد الغزالي) لەو بارەوە گوتوویەتی: (و الإجماعُ منعقدُ على وجوب التوبة)[٣].

هەروەها (القرطبي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (و اتّفقتِ الأُمةُ على أن التوبة فرض على المؤمنين)[٤].

هەروەها گوتوویەتی: (و هي فرض على الأعيانِ في كل الأحوالِ و كل الأزْمان)[٥].

دیسان (ابن تيمية)ش گوتوویەتی: (و لابد لكل عبْدٍ من توبة و هي واجبةٌ على الأولين و الآخرين)[٦].

---

(١) التحريم:٨

(٢) أخرجه أحمد: ١٧٨٨١، وعبد بن حميد: ٣٦٤، ومسلم: ٢٧٠٢.

(٣) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٤، ص٥.

(٤) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) ج٥، ص٩٠.

(٥) بڕوانە: هەمان سەرچاوە، ج١٨، ص١٩٧.

(٦) بڕوانە: (مجموع الفتاوى)، ج١٠، ص٣١٠.

بەڵێ خوێنەری بەڕێز!

لەسـەر هـەر ئینسـانێك پێویسـتییەكی تایبەتییـە كـە بگەڕێتـەوە بـۆ لای خـواو بـۆ لای پەشـێمان ببێتـەوە، ئنجـا ئەگـەر ئیمانـی نەهێنابـێ، یـان گیـرۆدە بووبـێ بـە شـیرك و نیفاقـەوە، ئیمـان بهێنـێ و واز لـە شـیرك و نیفـاق بێنـێ و، ئەگـەر ئیمانیشـی هێنابێ، بەڵام لاسارو گوناحبـار بێ، واز لـە گوناحباریی و لاساریی بێنـێ و، نیەتـی فەرمانبەرییەكـی سـاغ و بـێ خڵتـەو خـاڵ بێنـێ.

## تەوەری دوو: تۆبە پێویستە گشتگیر بێ و تێکڕای گوناحەکان بگرێتەوە

ئەمیش زانایان لەسەری کۆك و یەکدەنگن، چونکە ئەو ئایەت و فەرمایشتانەی کە لەوبارەوە هاتوون، گشتیی (عام)ین و، هەندێك لە گوناحەکانیان جیا نەکردۆتەوەو، تۆبەکە بە هەندێکیانەوە تایبەت نەکراوە.

خاوەنی کتێبی: (الفتوحات الإلهية) لەوبارەوە گوتوویەتی: (قال العلماء: التوبَةُ واجبة من كل معصية كبيرة أو صغيرة)[١]، واتە: زانایان گوتوویانە: تۆبە کردن لە هەموو گوناحێکی گەورەو گچکە فەرزە.

هەروەها (نووي)یش گوتوویەتی: (التوبةُ مِن جميع المعاصي واجبة..سواء كانت المعصية صغيرة أو كبيرة)[٢]، واتە: تۆبە لە تێکڕای گوناحەکان فەرزە... ئنجا چ گوناحەکە گەورە بێ، یان گچکە بێ.

لەوبارەوە کە ئایا پێویستە تۆبەکە هەر بە گشتیی و تێکڕایی (إجمالي) بێ، یان پێویستە بەوردیی و درێژیی (تفصيلي)، یەك یەکی گوناحەکان بگرێتەوە؟!

زانایان ڕایان جیاوازەو، واش پێ دەچێ ئەو ڕایە لە هەموویان چاکتر بێ کە دەڵێ: پێویستە تۆبەکردن لە گوناحەکان بە وردیی و درێژیی بێ، بۆ ئەو گوناحانەی کە زانراون و، بۆ ئەو جۆرە گوناحانەش کە هەموویان زانراو نین و نالوێ یەك یەکیان دیاریی (تحديد) بکرێن، ئەوە تۆبەی تێکڕایی (إجمالي)

---

(١) بڕوانە: (الفتوحات الإلهية بتوضيح تفسير الجلالين للدقائق الخفية) ج٤، ص٣٦٩، کە بە (تفسير الجمل) ناسراوە.

(٢) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١٧، ص٥٩.

بەسـە، (الآلـوسي) لەوبـارەوە گـوتوویەتـی: (إنمـا تصح التوبـةُ إجـمالاً، و أمـا مـا عُلـم تفصيـلاً، فإنَّـهُ لابـدّ مـن التوبـة منـه تفصيـلاً) [1].

هەروەهـا لەوبـارەوە کـە ئایا دروسـتە ئینسـان تۆبـە لـە بەشـێك لـە گوناحـەکان بـکاو، لەسـەر بەشێکیشـیان بـەردەوام بـێ؟! دیسـان زانایـان ڕای جیاجیایـان هـەن، هەرچـی زۆربـەی هـەرە زۆریانـن کـە بـە (أهـل السـنة و الجماعـة) ناسـراون، دەڵێـن: دروسـت (جائـز)ە، هەرچەنـدە بێگومـان فـەرزو پێویسـت و پەسـەند ئەوەیـە کـە تۆبـە لـە هەمـوو جۆرەکانـی گونـاح و لـەوردو درشـتیان بـێ، بـەڵام هەندێکیـان کـە لەژێـر نـاوو نیشـانی (معتزلـة)دا خۆیـان دەبیننـەوە، بـە دروسـتی نازانـن و دەڵێـن: دەبـێ تۆبـە سـەرلەبەری گوناحـەکان بگرێتـەوە، ئەگـەرنا دروسـت نیـەو وەرناگیـرێ! بـەڵام بێگومـان ڕای زۆربـەو جەمـاوەری زانایـان ڕاسـت و بەجێیـەو، گەلێـك بەڵگـەش پشـتگیرنی، بـۆ وێنـە:

١- خوای کاربەجێ لەبارەی بابای دز (سارق)ەوە، پاش ڕوونکردنەوەی حوکم و سزای دزیی، فەرموویەتی:

﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾[2]

واتـە: ئنجـا هـەر کەسـێك پـاش سـتەمکردنی تۆبـەی کـردو چاکـەی کـرد، ئـەوە بێگومـان خـوا تۆبـەی لـێ وەردەگـرێ، چونکـە خـوا لێبـوردەی بەخشـندەیە.

ئنجا ئاشـکرایە لێبوردنـی خـواو بەخشـینی بـۆ بابـای (دز) تایبەتـە بـە دزییەکەیەوە، کـە تۆبـەی لـێ کـردوە، بـەڵام گوناحـی دیکـەی کـە هەینـی و تۆبـەی لـێ نەکـردوون، ناکەونـە بـەر لێبـوردن و بەخشـینی خـواوە.

کەواتـە: دەگونجـێ ئینسـان تۆبـە لـە بەشـێك لـە گوناحـەکان بـکاو، تۆبەکەیشـی وەردەگیرێ.

---

(١) بڕوانە (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم) ج٢٨، ص ١٥٩.

(٢) المائدة:٣٩.

٢- هەروەها خوای دادگەر لە بارەی سوود خۆریی (المُرابَاة)یەوە، پاش ڕاگەیاندنی حوکمەکەی، فەرموویەتی:

﴿ وَإِن تُبۡتُمۡ فَلَكُمۡ رُءُوسُ أَمۡوَٰلِكُمۡ لَا تَظۡلِمُونَ وَلَا تُظۡلَمُونَ ﴾[١] .

واتە: ئەگەر تۆبەتان کرد (لە ڕیبا خۆریی) ئەوە سەرمایەکانی خۆتان هی خۆتانن، نەستەم دەکەن و نە ستەمیشتان لێ دەکرێ.

وەك دەبینین خوای بەخشندە مافی تۆبەکردنی داوە بە بابای سوود خۆر لە گوناحەکەی: (وإنْ تُبتم)، کەواتە: دەگونجێ بابای گوناحبار لە گوناحێك یان چەند گوناحی تایبەت بگەڕێتەوەو لێیشی قبووڵ دەکرێ.

٣- پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی (ماعز بن مالك)ەوە کە هاتە لای پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و دانی بە زیناکردنیدا هێناو، پاشان حوکمی بەرد بارانکردن (رجم)ی بەسەردا چەسپێنراو مرد، فەرموویەتی: {لَقَدْ تَابَ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ أُمَّةٍ لَوَسِعَتْهُمْ}[٢]، واتە: بە تەئكید تۆبەیەکی کردوە، ئەگەر بەسەر ئۆممەتێکدا دابەش کرابایە بەشی دەکردن.

دەجا ئاشکرایە کە ئەگەر تۆبەکردن لە یەکێك یان بەشێك لە گوناحەکان قبووڵ نەکرابایە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بە (ماعز)ی دەفەموو: کە پێویستە لە سەرجەم گوناحەکانی دیکەشت تۆبە بکەی!

**ئەمەش چەند قسەیەکی زانایان لەوبارەوە:**

٤- (إمام الحرمين الجويني) گوتوویەتی: (من احتقب أوزاراً و قارف ذنوباً، صحَّتْ توبته عن بعضها مع الإصرار على بعضها)[٣] ، واتە: کەسێك هەگبەی هەڵگرتبێ و

---

(١) البقرة:٢٧٩.

(٢) أخرجه مسلم: ١٦٩٥، عن سليمان بن بريدة عن أبيه.

(٣) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي)، ج١٧، ص٦٠، وە (شرح المقاصد)، ص١٧٩.

تاوانی کردبن، تۆبەکردنی لە هەندێکیان دروستە، هەرچەندە لەسەر هەندێکی دیکەیان بەردەوام بێ.

٥- (ابن تیمیة)ش گوتوویەتی: (و تصح التوبة من ذنب مع إصرارهِ على آخر عند السلف و الخلف)[1]، واتە: لە لای زانایانی پێشین و پاشین، تۆبەکردن لە گوناحێك، وێڕای بەردەوام بوون لەسەر یەکێکی دیکە، دروستە.

٦- هەروەها (إبن القیم)یش هەمان شتی گوتوە[2]، بەڵام مەرجێکی تێدا بە مەرج گرتوە، کە بریتیە لەوەی ئەو گوناحەی کە لەسەری بەردەوامە، نابێ هەر لە جۆری گوناحە تۆبە لێکراوەکە بێ، بۆ وێنە: کەسێك زیناکەرو نێربازیش بێ، دەبێ واز لە هەردووکیان بهێنێ، ئەگەرنا تۆبە لە یەکیان لەگەڵ بەردەوامیی لەسەر ئەوی دیکەیان قبووڵ نابێ، چونکە هەردووکیان یەك جۆرە گوناحن.



---

(١) بڕوانە: (مختصر الفتاوى المصرية)، ص١٣٧.

(٢) بڕوانە: (مدارج السالكين) ج١، ص(٢٧٥-٢٧٦).

## تەوەری سێ: پێویستە تۆبەکە بەردەوام بێ

ئەمیش زانایان لەسەری یەکدەنگن، چونکە ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری سەرودەرمان (صلی الله علیه وسلم) کە پێشتر هەندێکیانمان بە نموونە هێنایەوە، هەر ئەوە دەگەیەنن کە پێویستە تۆبە بەردەوام بێ و بێ پسانەوە بێ، بۆ وێنە: سەرنجی ئەم فەرموودەیە بدە کە حاڵەت و ڕەفتاری پێغەمبەرمان (صلی الله علیه وسلم) لەوبارەوە بۆ ڕوون دەکاتەوە: {عَنِ ابْنِ عُمَرَ، قَالَ: كَانَ يُعَدُّ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِي الْمَجْلِسِ الْوَاحِدِ مِائَةُ مَرَّةٍ مِنْ قَبْلِ أَنْ يَقُومَ: رَبِّ اغْفِرْ لِي وَتُبْ عَلَيَّ إِنَّكَ أَنْتَ التَّوَّابُ الْغَفُورُ}[1] ، واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لە کۆڕێکدا بەر لە هەڵسان، سەد جار ئەم زیکرەی لێ دەژمێررا: پەروەردگار! لێم ببوورەو تۆبەم لێ وەربگرە، بێگومان بەس تۆی زۆر تۆبە وەرگری لێبووردەی.

ئنجا بێگومان پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) پێشڕەو (أسوة)ی ئۆممەتەکەیەتی و ئەگەر ئەویش لەگەڵ ئەو هەموو پایە بەرزییەیدا، پێویستی بە تۆبەو گەڕانەوە لای خوا بەردەوام بووبێ، دیارە ئێمەومانان حەوجار حەوجار ئاتاجی ئەوەین، وەك پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: ((كل بني آدم خطاء و خير الخطائين التوابون))[2] ، واتە: تێکڕای ئادەمزادان زۆر خەتاکارن، چاکترین گوناحبارانیش تۆبەکارانن.

(إبن تيمية)ش لەوبارەوە کە پێویستە ئینسان هەمیشەو بەردەوام سەرگەرمی تۆبەو گەڕانەوە لای خوا بێ گوتوویەتی: (فليس لأحدٍ أن يظن استغناءه من

---

(١) أخرجه الترمذي: ٣٤٣٤، قال: هذا حديث حسن صحيح و غريب.

(٢) أخرجه الترمذي: في سننه: ٢٦١٦، وقال هذا حديث غريب.

التوبـة إلــى اللـه والإســتغفار مـن الذنـوب، بـل كل أحـد محتـاجٌ إلى ذلـك دائمـاً)[١] ، واتـە: جا هیـچ کەسێك بۆی نیە پێی وابێ لـە تۆبەو گەڕانـەوە لای خـواو داوای لێبوردنکردنی بۆ گوناحەکان بێ نیازە! هەمـوو کەسێك بـەردەوام ئاتاجی ئەوەیە.



---

(١) بڕوانە: (الفرقان بين أولياء الرحمن و أولياء الشيطان)، ص٩٥.

## تەوەری چوار:
## پێویستە دەستبەجێ تۆبە لە گوناحەکان بکرێ

ئەمیش زۆربەی هەرەزۆری زانایان لەسەری کۆکن و، دەگونجێ ئەم بەڵگانەش بۆ ئیسپاتی ئەم مەسەلەیە بهێنرێنەوە:

١- خوای تاوانپۆش فەرموویەتی: ﴿وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ..﴾[١]، واتە: پەلەش بکەن بەرەو لێبوردنێکی تایبەت لە پەروەردگارتانەوە.

٢- خوای دادگەر دەربارەی سەجدەی ڕێزگرتن نەبردنی ئیبلیس بۆ ئادەم -علیه السلام-، فەرموویەتی:

﴿...ثُمَّ قُلۡنَا لِلۡمَلَٰٓئِكَةِ ٱسۡجُدُواْ لِأٓدَمَ فَسَجَدُوٓاْ إِلَّآ إِبۡلِيسَ لَمۡ يَكُن مِّنَ ٱلسَّٰجِدِينَ ١١ قَالَ مَا مَنَعَكَ أَلَّا تَسۡجُدَ إِذۡ أَمَرۡتُكَۖ قَالَ أَنَا۠ خَيۡرٞ مِّنۡهُ خَلَقۡتَنِي مِن نَّارٖ وَخَلَقۡتَهُۥ مِن طِينٖ﴾[٢]،

واتە: پاشان بە فریشتەکانمان فەرموو: سەجدە بۆ ئادەم ببەن! ئنجا یەکسەر[٣]، سەجدەیان برد، جگە لە ئیبلیس لە کڕنووش بەران نەبوو، (خوا) فەرمووی: چ شتێك پێشگیرت بوو کە سەجدە ببەی کاتێك کە ئەمرم پێکردی؟! گوتی: من لەو چاکترم، منت لەئاگر دروستکردووەو ئەوت لە قوڕ دروستکردووە.

کەواتە: مادام ئیبلیس لەسەر ئەوە سەرزەنشت کراوە کە دەستبەجێ (فوراً) فەرمانی خوای جێبەجێ نەکردوە، دیارە فەرمان (أمر) بۆ ئەوەیە بە زوویی و

---

(١) آل عمران:١٣٣.

(٢) الأعراف:١١-١٢.

(٣) چونکە پیتی (ف) لێرەدا بۆ بەدواداهاتن (تعقیب)ە، وەك شارەزایانی زمان گوتوویانە.

دەستبەجێ جێبەجـێ بکـرێ، دەجـا فەرمانکـردن بـە تۆبـەش هەروایـە: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةٗ نَّصُوحًا ﴾(١).

ئنجـا ئەگـەر هـات و بەڵگـەو نیشـانەیەکیش لەسـەر ئـەوە هەبـوو کـە فلانـە فەرمـان دەسـتبەجێ بـوون (فوریـة)ی تێـدا بـە مـەرج نەگیـراوە، ئـەوە هـەڵاواردن (إسـتثناء)ێکە لـەو حوکمـە گشـتییە.

٣- خوای میهرەبان دەربارەی کەسانێك کە لەسەر گوناح و خراپە بەردەوام بوون، فەرموویەتی: ﴿ كَلَّاۖ بَلۡۜ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُواْ يَكۡسِبُونَ ﴾(٢).

واتـە: نـا وانیـە، بەڵکـو کـردەوە خراپەکانیـان ژەنگـی لەسـەر دڵەکانیـان پەیداکردوە، دیـارە پێویسـتیشـە ئینسـان لـێ نەگـەڕێ کـە دڵ و دەروونـی بەهـۆی گونـاح و تاوانـەوە ژەنـگاوی ببـێ و کەمـڕە هەڵبێنـێ، بۆیـە دەسـتبەجێ تۆبەکـردن و گەڕانـەوە بۆ لای خـوا لەهـەر گوناحێـك، فـەڕزو پێویسـتە.

٤- ئنجا شتێکی ئاشکرایە کە نقووم بوون لە زەلکاوی گوناحدا، شتێکی یەکجار خراپ و ناقۆڵایەو، گوناح و خراپەو تاوانەکان وەك ژەهرێکی فەوتێنەر وان و، خۆ لێ پاراستنی ئەو زەلکاوە خنکێنەرو ژەهرە فەوتێنەرەش، فەڕزە دەستبەجێ و بێ وەخران بێ!

**ئەمەش چەند قسەیەکی زاناو پێشەوایانمان لەوبارەوە:**

١- (أبو حامد الغزالي) گوتوویەتی: (أما وجوبُها على الفور فلا يُستراب فيه، إذْ معرفة كون المعاصي مهلكاتٍ من نفس الإيمان، و هو واجب على الفور)(٣)، واتە: ئەوە کە پێویستە دەستبەجێ تۆبە بکرێ، گومانی تێدا نیە، چونکە زانینی ئەوە کە گوناحەکان فەوتێنەرن، لە خودی ئیمانەو ئیمانیش پێویستە دەستبەجێ و بێ وەخران بێ.

---

(١) التحريم:٨.

(٢) المطففين:١٤.

(٣) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٤، ص٧.

٢- (النووي)یش گوتوویەتی: (واتفقوا على أَن التوبة من جميع المعاصي واجبة، وأنها واجبة على الفور لايجوز تأخيرها، سواء كانت المعصية صغيرة أو كبيرة) [١]، واتە: زانایان لەسەر ئەوە ڕێك كەوتوون كە تۆبە لە هەموو گوناحەكان فەرزە، پێویستە دەستبەجێش بێ و، دروست نیە دوابخرێ، ئنجا گوناحەكە چ گچكە بێ چ گەورە.

٣- (ابن القيم)یش گوتوویەتی: (إن المبادرة إلـى التوبة من الذنب فرض على الفور، لايجوز تأخيرها فمتى أخَّرها عصى بالتأخير) [٢]، واتە: خێرایی كردن لە تۆبەدا لە گوناحەكان، پێویستە یەكسەر بێ و دروست نیە دوابخرێ، ئنجا هەركات دوای خست، بە وەخراندنەكەی گوناحبار دەبێ.

لێرەشدا كۆتایی بە باسی (حوكمی تۆبە) دێنین و دەچینە سەر بەشی سێیەم و، باسی چۆنیەتی تۆبەكردن و تۆبەی ساغ و ڕاست (التوبـة النصوح) دەكەیـن.



---

(١) بڕوانە (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١٧، ص٥٩.

(٢) بڕوانە: (مدارج السالكين شرح منازل السائرين) ج١، ص٢٧٢.




# چۆنیەتی تۆبەکردن و تۆبەی ڕاست و ساغ (التوبة النّصوح)

١- چۆنیەتی تۆبەکردن
٢- پێناسەی تۆبەی ڕاست و ساغ

خوێنەری سەنگین!

ئەم بەشەش لە دوو تەوەردا پێشکەش دەکەین:

## تەوەری یەکەم: چۆنیەتی تۆبەکردن[١]

پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {مَا مِنْ رَجُلٍ يُذْنِبُ ذَنْبًا ثُمَّ يَقُومُ فَيَتَطَهَّرُ، ثُمَّ يُصَلِّي، ثُمَّ يَسْتَغْفِرُ اللَّهَ، إِلَّا غَفَرَ اللَّهُ لَهُ}[٢]، واتە: هەرکەسێك[٣] تاوانێك بكا، پاشان هەستێ و خۆی پاك بكاتەوە (واتە خۆی بشوات یان دەستنوێژ بگرێ) ئنجا دوو ڕکات نوێژ بكا، دوایی داوای لێخۆشبوون لە خوا بكا، بێگومان خوا دەیبەخشێ.

کەواتە: خوێنەری شیرین! مسوڵمانی بەڕێز!

ئەگەر دەتەوێ ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون بگری، هەنگاوی یەکەمت ئەوەیە کە بە نیازی تۆبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خواوە، خۆت بشۆی، یان ئەگەر بۆت ڕێ نەکەوت خۆت بشۆی، دەست نوێژێکی پوخت بگری، ئنجا دوو ڕکات نوێژی تۆبە بکە.

دوایی هەتا دەتوانی سوپاس و ستایشی خوا بکەو صەڵات و سەلام بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بنێرە، ئنجا چاو بە ڕابردووی خۆتدا

---

(١) ئەم باسە لە کتێبی (ڕێگای صالح بوون..) وەرگیراوە، لاپەڕە: (٣٣-٣٧)، چاپی سێیەم.

(٢) أخرجه الترمذي: ٤٠٦، وقال: حديث حسن.

(٣) هەرچەندە (رجل) پیاوە، بەڵام لێرەدا مەبەست ئینسانە بە گشتیی و لەبەر (تغليب) وشەی (رجل) بەکارهاتوە، بۆیە من بە (هەرکەسێك) مانام کردوە.

بگێـڕە، هەمـوو ئـەو تـاوان و خراپانـەی کـە بـە دڵ و عەقـڵ و زمـان و چـاوو گـوێ و دەسـت و لاق و گـەدە... هتـدت کردووتـن، وەبیـر خۆتیـان بهێنـەوەو بـە گەردنـی کـەچ و ڕووی زەردو چـاوی فرمێسـکاویی و دەنگێکـی کـزو بـە لالانـەوەو کڕووزانـەوەو فرمێسـك باراندنـەوە، دەسـت بـەرز بکـەوەو بڵـێ: خوایـە! مـن هەمـوو ئـەو تـاوان و خراپانـەو زۆری دیکـەش کـە مـن یـان لـە یـادم نەمـاون، یـان هـەر نەمزانیـوە، کردوومـن، لێیـان پەشـێمانم و دان بـە هەڵـەو ناتەواویـی خۆمـدا دێنـم، بـەڵام لێـم ڕوونـە کـە تـاوان و خراپەکانـم هەرچەنـدە زۆر بـن، لێبوردنـی تـۆ زۆرتـرە، هەرچەنـدە گەورەبـن، بەزەیـی تـۆ مـەزن تـرە! ئنجـا خوایـە! داوای لێبـوردن و چاوپۆشـییت لـێ دەکـەم و، تـۆش نائومێـدم مەکـەو بـە لوتـف و بەزەیـی خـۆت بمبـوورە، چونکـە ئەگـەر منیـش شـیاوی بەخشـران نەبـم، تـۆ شایسـتەی لێبـوردن و بەخشـینی!

ئنجـا پـاش ئـەوە جارێکـی دیکـەش چاوێکـی ورد بـە لیسـتی گوناحەکانتـدا بگێڕەوە، بزانـە چەندیـان پەیوەندییـان بـە خـواوە هەیـە، ئـەوە ئومێـد وایـە ئەگـەر بـۆ لای خـوا گەڕانەوەکـەت بـە ڕاسـتیی بووبـێ، خـوا لـە هەقـی خـۆی بتبـوورێ، بـەڵام ئـەو تـاوان و گوناحانـەی کـە پەیوەندییـان بـە خەڵکـەوە هەیـەو، مافـی خەڵکییـان خسـتوویە سـەر، ئـەو جـۆرە گوناحانـە وێـڕای ئـەوەی گوتمـان، چەنـد شـتێکی دیکـەش هـەن دەبـێ ڕەچاویـان بکـەی، ئەگـەر بتـەوێ خـوای بەخشـەر ئەوانیشـت لـێ بسـڕێتەوەو بـە یەکجاریـی ڕزگـارت بـێ:

١- چاو بە ڕابردووی خۆتدا بگێڕەوەو زۆر بە وردیی سەرنج بدە، بزانە داخۆ هەر لەکاتی باڵغ بوونتەوە، هەتا ئەو سەعاتەی ئێستات کە تۆبەی تێدا دەکەی، چ کەسێك مافێکی بەسەرتەوە هەیەو زیانێکت پێگەیاندوە، ئنجا چ غەیبەتکرد بێ، یان بوختانت پێوە کردبێ، یان حەسوودییت پێ بردبێ، یان خۆتت بەسەردا هەڵکێشابێ، یان دڵت شکاندبێ، یان گاڵتەت پێکردبێ، یان ماڵت خواردبێ، یان گومانی بەدت پێی بردبێ..هتد.

ئنجا کە هەمـوو ئەو کەسانەت وەبیـر خـۆت هێنانەوە، کە مافێك یـان چەنـد مافێکیـان لەوجۆرە مافانـە لـە سـەرتە، بـە دڵێکـی غەمگیـن و چاوێکـی بەگریـان و

ڕەنگێکی زەردو هەڵبڕزکاوەوە، دەست بەرەو ئاسمان بەرزبکەوەو، بۆیان دەست بکە بە پاڕانەوەی گەرم و بەکوڵ و، هەوڵ بدە چاکترین دووعای دنیاو دوڕۆژیان بۆ بکەی، بە تایبەت لەوبارەوە کە خۆت بە قەرزارداریان دەزانی، بۆ وێنە: ئەگەر بۆیە غەیبەتت کردبوون کە لە ئابڕوو (سمعة)یان کەم بکەیەوەو، لە پلەوپایەی نێو جەماوەریان داشکێنیی، داوا لە خوای بەرزو مەزن بکە کە ناوو پلەوپایەیان بەرز بکاتەوەو، ڕێزو حورمەتیان زیاد بکات و، ئەگەر بۆیە حەسوودییت پێی بردوە، چونکە تێگەیشتنی لە تۆ زیاترو ڕەوشت و خووی لە هی تۆ بەرزترەو جوانترە، لە خوا بپاڕێوە کە زانیاریی و تێگەیشتنی پتر بکات و، ڕەوشت و ئاکاری پەسەند تر بکات و، ئەگەر لەبەر دەوڵەمەندیی و دارایی ڕقت لێی بۆتەوەو هەوڵی زیان لێدانیت داوە، ئەوە داوای بۆ لە خوا بکە کە ڕۆزیی و ماڵی حەڵاڵی بۆ زیاد بکا... هەروەها.

بەڵام گرنگ ئەوەیە بەدڵێکی ساغ بۆ ئەو خاوەن مافانە بپاڕێیەوەو، لە قووڵایی دڵەوە حەز بکەی خوا چی خێرو چاکەیە، بۆیان بکا، نەك لە دەمی پاڕانەوەشدا، شەیطانی بەدو پیس فێڵت لێ بکات و، هەروا بە سادەیی و لام سەللایی دووعایان بۆ بکەی!

ئنجا دوای ئەوە بیربکەوەو بزانە کێی وا هەیە بتبوغزێنێ، یان گومانی خراپت پێ ببات، یان غەیبەتت بکا، یان ئازارت بدات، یان حەسوودییت پێ ببات، یان ..یان..هتد، دوای ئەوەی یەك یەکی ئەوانەت لە ئاوێنەی خەیاڵتدا ئامادەکردن، بە دڵ و کوڵ بۆیان لە خوای میهرەبان و بەخشندە بپاڕێوەو بڵێ: خوای پەروەردگارم! تۆ لێبووردەی و لێبوردنت خۆشدەوێ، بۆیە ئەوە من لە هەموو ئەو کەسانە بووردم کە بە هەر جۆرو شێوەیەك بووە، ئازاریان داوم و زیانیان لێداوم، ئنجا داوات لێ دەکەم، تۆش بە لوتف و کەرەمی بێ سنوورو بەزەیی بێ پایانت، بیانبەخشی و چاوپۆشییان لێ بکەی[1]، دەجا خوایە! وەك

---

(١) هەڵبەت ئەمە بەس بۆ مسوڵمانانە، چونکە بۆ نا مسوڵمان دروست نیە، مەگەر دووعای هیدایەت، وەك خوا فەرموویەتی: ﴿ مَا كَانَ لِلنَّبِيِّ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَن يَسْتَغْفِرُوا لِلْمُشْرِكِينَ وَلَوْ كَانُوا أُولِي قُرْبَىٰ ... ﴾ التوبة:١١٣.

چۆن مـن لـە مافەکانـی خـۆم بـوردم و گەردنـی ئەوانـەم ئازادکـرد، کـە ئـازارو زیانیـان تـووش کـردووم، تـۆش بـە میهرەبانیـی و بەخشـندەیی خـۆت بـم بەخشـەو، مافی خەڵکیـم لەسـەر لابەرەو، لـە چڵك و چەپەری ئەو جۆرە خراپەو گوناحانـە قوتـارم بکـە!

٢- دوایی هەوڵ بدە هەرکەسێك[1]، کە بە هەرشێوەك زیانت لێداوەو دڵت ئازارداوە، داوای لێبوردن و گەردن ئازادیی لێ بکەی و، ئەگەر بگونجێ و بزانی زیانی پتر نابێ، دەقی ئەو ئازارو زیانەیشی بۆ بگێڕەوە، ئەگەرنا پێویست ناکات.

٣- هەوڵ بدە ماڵی هەر خاوەن مافێکی زیندووت بەلاوەیە، بیدەیەوە، ئەگەر مردبیش، بیدەوە بە میراتگرەکانی، ئەگەر نەشگونجاو مسوڵمانانیش (بيت المال) یان هەبوو، بەڵام هی ڕاستەقینە، بۆی بخە (بيت المال)ەوە، ئەگەر نەشبوو، بۆی بکە بە چاکەو خێر بۆی ببەخشە.

ئنجا مسوڵمانی بەڕێز!

ئەگـەر ئـەو شـتانەی گوتـران، هەموویـان یـەك بـە یـەك و مـوو بـە مـوو جێبەجـێ بکـەی، ئـەوە زۆر مسـوگەرو دڵنیابـە، ئەگـەر بێـت و بـە دڵێکـی ڕاسـت و سـاغ ئـەو تۆبەیـەت کردبـێ و، بێجگـە لـە ڕازییکردنـی خواو لـە خوا نیزیـك بوونـەوە، هیچـی دیکـەت لـە دڵ نەگرتبـێ، ئـەوە ئومێدوایـە کـە خراپـەو تاوانەکانت هەرچۆنێکـی و هەرچەندێکـی بـن، خـوای میهرەبـان و بەخشـندە بـە ئـاوو تـەرزەو بەفـری بەزەیـی و بەخششـی خـۆی لێـت بشـوات و، وەك قوماشـێکی سـپیی چـاك شـۆراو پـاك ببیتـەوە، چونکـە پێغەمبـەری خـوا (صلـى اللـه عليـه وسـلم) فەرموویەتـی: {التَّائِـبُ مِـنْ

---

(١) ئەگـەر دەتـەوێ بـە تێروتەسـەلیی لـەم مەسـەلەی (حـق النـاس) ڕەتکردنـەوەو چۆنیەتـی خۆرزگار کردن لەو مافانە حاڵی بی، بەوردیی سەرنجی: (الزواجر عن إقتراف الكبائر)ی (ابن الحجر الهيتمي) بدە، ج٢، ص١٨١، (الكبيـرة) ٤٦٣ (ترك التوبة من الكبيـرة)، دیاره خۆشـمان لـە باسـەکانی داهاتوودا شتێکی هـەر لێوە بـاس دەکەیـن.

الذَّنْـبِ كَمَـنْ لَا ذَنْـبَ لَـهُ}[1]، واتـە: تۆبـە كـردوو لـە گـونـاح، وەك كەسێكە كە هـەر گوناحی نەبێ.

ئێستاش بەر لەوەی ئەم تەوەری یەكەمە بەجێ بهێڵین و بچینە سەر تەوەری دووەم، كە پێناسەی تۆبەی ڕاست و ساغ (التوبة النصوح)ە، بە پێویستی دەزانم چوار سەرنجی دیكەش لە بارەی چۆنیەتی تۆبەكردنەوە بخەمەڕوو:

١- گەڕانەوە بۆ لای خوا، مەرج نیە تەنیا دوای قەتڵ و زیناو دزیی و ڕێگریی و هاو وێنەكانیان بێ، بەڵكو ئینسانی مسوڵمان پێویستە هەمیشەو دایم هەست بە كەم و كووڕیی و گوناحباریی و قەرزداریی بكات، لە بەرامبەر خوای دادگەرو بەخشەرداو، بەردەوام سەرگەرمی گەڕانەوە لای و پەشێمان بوونەوەو داوای لێبوردن لێكردنی بێ.

بە ئەزموونی خۆشم بۆم دەركەوتوە، كە وەك چۆن جەستە پێویستیی بە پاك و خاوێنی و شۆردن و خزمەت هەیە، ڕووحیش هەروایەو، تۆبە وەك گەرماو (حمام) ێك وایە، كە دەبێتە مایەی ساف و ساغ و پاك بوونەوەی ڕووح، لە چڵك و چەپەرو تۆزو خۆڵی گوناح و هەڵەو پەڵەو بێ ئاگاییەكان.

٢- تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، بۆ هەركەسێك لە قەدەر ئیمان و مسوڵمانەتیی خۆیەتی و، هی هەموو كەس وەك یەك نیەو، هەركەسێك بە جۆرێك تۆبە دەكات و لە چەند شتێك تۆبە دەكات، كە لەگەڵ ئاستی خۆیدا بگونجێ، كەواتە با هیچ كەس وا گومان نەبات كە (أستغفرُالله و أتوب اليه) فەرموونی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) وەك هی خەڵكی دیكە وایە، جوانیش گوتراوە: (حسنات الأبرار سيئات المُقَرَّبين)، بەڵێ ئەوەی كە هەندێك كەس پاداشتی لەسەر وەردەگرن، خەڵكێكی دیكەی لەسەر سەركۆنە دەكرێن و سزا دەدرێن!

٣- تۆبەكردن لە هەموو گوناحەكان وەك یەك نیەو، گوناح هەتا گەورەترو خراپتر بێ، مەرجەكانی تۆبە لێكردنیشی زیاترو قورسترن، بۆ وێنە:

---

(١) أخرجه ابن ماجه: ٤٢٥٠، وصححه الألباني.

سەرنج بدە! چۆن خوای پەنهان بین بۆ تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای بابای دەغەڵ (منافق)، چوار مەرجی گرنگی داناون و فەرموویەتی:

﴿ إِنَّ ٱلۡمُنَٰفِقِينَ فِي ٱلدَّرۡكِ ٱلۡأَسۡفَلِ مِنَ ٱلنَّارِ وَلَن تَجِدَ لَهُمۡ نَصِيرًا ﴿١٤٥﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ وَأَصۡلَحُواْ وَٱعۡتَصَمُواْ بِٱللَّهِ وَأَخۡلَصُواْ دِينَهُمۡ لِلَّهِ فَأُوْلَٰٓئِكَ مَعَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَۖ وَسَوۡفَ يُؤۡتِ ٱللَّهُ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَجۡرًا عَظِيمًا ﴾[1].

وەك دەبینین خوای کاربەجێ وێڕای (تۆبە):

أ- چاکەکاریی (إصلاح) و،

ب- دەست دەرێسمانی خوا گرتن (الإعتصام بالله) و،

ج- دینداریی بۆ خوا ساغکردنەوە (إخلاص الدين لله)ی، کردوونە مەرجی تۆبەی مونافیق.

٤- وەك پێشتریش ئاماژەمان پێکردوە، گەڕانەوە بۆ لای خوا (التوبة إلى الله) تایبەت نیە بە مسوڵمانانەوە، هەرچەندە زیاتر ئەوان دەگەڕێنەوە، بەڵکو بابای کافرو بێدینیش، هەر دەبێ تۆبە بکات و بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، ئەوەندە هەیە بابای مسوڵمان لە گوناح و خراپەکاریی، بەڵام کافر لە کوفرو شیرك و دوور لەخوایی، وەك خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:

﴿ فَإِذَا ٱنسَلَخَ ٱلۡأَشۡهُرُ ٱلۡحُرُمُ فَٱقۡتُلُواْ ٱلۡمُشۡرِكِينَ حَيۡثُ وَجَدتُّمُوهُمۡ وَخُذُوهُمۡ وَٱحۡصُرُوهُمۡ وَٱقۡعُدُواْ لَهُمۡ كُلَّ مَرۡصَدٖۚ فَإِن تَابُواْ وَأَقَامُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتَوُاْ ٱلزَّكَوٰةَ فَخَلُّواْ سَبِيلَهُمۡۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾[2].

واتە: ئنجا هەر کاتێك چوار مانگەکان (کە وەك مۆڵەت دانراون) بەسەرچوون، ئەوە هاوبەش بۆ خوا دانەرەکان لە هەر جێیەك بەرپەلتان کەوتن بکوژن و،

---

(١) النساء:١٤٦

(٢) التوبة:٥.

بیانیانگـرن و ئابڵووقەیـان بـدەن و، لـە هـەر کەمینگایـەك بۆیـان بچنـە بۆسـەوە، ئنجـا ئەگـەر هـات و تۆبەیـان کـردو نوێژیـان بەرپاکـردو زەکاتیانـدا، ئـەوە ڕێیـان بەربـدەن، بێگومـان خـوا لێبـوردەی بەخشـندەیە.

ئێسـتاش بـا بچینـە سـەر تـەوەری دووەم، کـە ڕوونکردنـەوە و پێناسـەکردنی تۆبـەی ڕاسـت و سـاغە:

## تەوەری دووەم:

## تۆبەی ڕاسـت و سـاغ (التوبة النّصوح) یانی چی!!

خـوای بەخشـندەو بـە بەزەیـی فـەرموویەتـی: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةً نَّصُوحًا﴾[١]، واتـە: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! بەڕاسـت و سـاغیی بگەڕێنـەوە لای خـوا، وشـەی (توبـة) پێشـتر پێناسـە کـراو، وشـەی (نصوح)یـش زانایـان چەنـد مانایەکیـان بـۆ هێنـاوە:

١- هەرچی (إبن منظور)و (الجوهري)ین، گوتوویانە[٢]: بە مانای (خالص) ساغ و بێ خڵتە دێ، (نصح الشَّيءُ: خلص، والنصح: نقيض الغش.. و رجل ناصح الجيب، نَقيٌّ الصدر، ناصح القلب: لا غش فيه، كقولهم، طاهر الثَّوب)، واتە: (نَصَحَ الشيءُ) یانی: ساغ بۆوەو، (نُصح) پێچەوانەی فێڵە... (رجلٌ ناصحُ الجيب، نقيٌّ الصَّدر، ناصح القلب) یانی: سینە ساف و بێ خەوش، وەك دەگوترێ: پۆشاك چاك.

٢-بەڵام (أبو زيد) ڕای وایە کە ڕستەی (نَصَحْتُهُ) بە مانای: (صَدَقْتُهُ)دێ، واتە: لەگەڵی ڕاست بووم و، (التوبه النصوح) یانی: (الصادقة) گەڕانەوەی ڕاست و دروست.[٣]

٣- هەروەها (الجوهري)[٤] ڕای وایە کە ڕستەی: (نَصَحَ الثَّوْبَ و القميص ينصحه نصحاً وتَنَصَّحَهُ: خاطه)، کەواتە: (نصح) یانی: دروون و، (نصحت الثوب: خِطْتُهُ) واتە: پۆشاکەکەم درووی.

---

(١) التحريم:٨.

(٢) بڕوانە: (لسان العرب) ج٢، ص (٦١٥، ٦١٧)، و: (الصحاح) ج١، ص(٤١٠-٤١١).

(٣) بڕوانە: (الصحاح) للجوهري، ج١، ص ٤١١.

(٤) بڕوانە: (الصحاح) ج١، ٤١١.

ئنجا شـەرعزانان (الفقهـاء)و توێـژەرەوان (المُفسِرون)یـش هـەر لەبـەر ڕۆشـنایی مانـای زمانیـی (المعنـى اللغـوي) وشـەی (نصـوح)دا، پێناسـەی تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ (التوبـة النصـوح) یـان کـردوە، بـۆ وێنـە:

* (ابـن كثيـــر) گوتوویەتـی: (..توبـة نصوحـاً: أى توبـة صادقـة جازمـة تمحــو مـا قبلهـا مـن السـيئات و تَلُـمُّ شَـعْثَ التائـب و تجمعـه و تَكُفُّـهُ عـما يتعطـاه مـن الدنـــاءات)[1] ، واتـە: تۆبـەی نەصـووح یانـی: تۆبەیەکـی ڕاسـت و پتـەوی وا، کـە هەرچـی خراپـەی پێشـووە بسـڕێتەوەو، کاروبـاری بابـای تۆبـەکارو حـاڵ و باڵـی خڕبکاتـەوە سـەریەك و، لـەو کـردەوە نـزم و پەسـتانەی کـە دەیکـردن، بیگێڕێتـەوە.

* (ابـن قيـم الجوزيـة)ش لـە پێناسـەی (التوبـة النصـوح)دا گوتوویەتـی: (والنصـح في التوبـة تَخَلُّصها مـن كل غـش و نقـص و فسـاد، وإيقاعُها عـلى أكمـل وجـه والنصـح ضـد الغـش) [2]، واتـە: سـاغیی و ڕاسـتیی لـە تۆبـەدا بریتیـە لـە پاڵاوتنـی و پاككردنـەوەی لـە هـەر خڵتـە و ناتەواویـی و خراپەیـەك و، ئەنجامدانـی بـە چاكتـرین و تەواوتریـن شـــێوە، (نصـح) پێچەوانـەی خـەش (غـش)ە.

* (الآلوسي)یـش لـە بـارەی هـۆی ناونرانـی تۆبـەی تێروتـەواوە بـە (نصـوح)، گوتوویەتـی: (وجــوز أن يكــون المــرادُ بالتوبــة النصــوح، توبــة تنصــح النــاس أي تدعوهــم إلـــى مثلهــا، لظهــور أثرهــا في صاحبهــا واســتعمال الجــد والعزيمة فـــي العمــل بمقتضاهــا) [3]، واتـە: دەگونجـێ مەبەسـت لـە (التوبـة النصـوح) تۆبەیـەك بـێ کـە بـۆ خەڵكـی دەبێتـە دڵسـۆز (ناصـح) یانـی بانگیـان دەكات بـۆ تۆبەیەكـی بـەو شـێوەیە، چونكـە شـوێنەواری لەسـەر خاوەنەكـەی دەركەوتـوە، بانگیـان دەكات بـۆ بەكارهێنانـی جیددییـەت و ئیـرادەی پتـەو لـە كاركردنـدا بـە پێـی داخوازیـی ئـەو تۆبەیـە.

---

(١) بڕوانە: (تفسير القرآن العظيم) ج٤، ص١٩١.

(٢) بڕوانە: (مدارج السالكين) ج١، ص (٣٠٩-٣١٠).

(٣) بڕوانە: (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم) ج٢٨، ص١٥٨.

* (ابـو إسـحاق)یش لەوبارەیـەوە گوتوویەتـی: (التوبـة النصـوح: أي بالغـة فـي النصـح، وهـي الخياطـة، كأن العصيـان يَخْـرِقُ والتوبـة تُرَقِّـعُ) [1]، واتـە: تۆبـەی نەصووح یانـی: زیادەڕۆیـی کردبێ لـە (نصح)دا کـە دروون (خیاطـة)ە، یانـی: سـەرپێچیی پۆشـاکی دیـن دەدڕێنـێ و، تۆبـەش پینـەی دەکات و دەیدووریتـەوە.

کەواتـە: تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ و تـەواو (التوبـة النصـوح) بریتیـە لـە جـۆرە گەڕانـەوەو ئاشـتبوونەوەیەك، لەگـەڵ خـوای بـە بەزەیـی و بەخشـەرو دادگـەردا، کـە پەشـێمانییەکی لـە قووڵایـی دڵ وەدەروون و، دەسـت لـە گونـاح و هەڵـە هەڵگرتنێکـی دەسـت بەجـێ و، بڕیـارو عەزمێکـی پۆڵاییـن لەسـەر طاعـات و بانەدانـەوە بـۆ سـەرپێچیی تێدابـن و، هەمـوو ئەمانـەش بـە هانـدەرو پاڵنـەری تەنیـاو بـێ خلْتـەی شـەرم و شکۆ لە خوا کردن و، سام و هەیبەت لـێ کردنی و، گلەیی نەهێشـتنی و، ڕازیکردنـی و، بـە دیـداری بـەرز شـادبوونی بـن[2].

دیـارە هـەر تۆبەیەکـی ئـاواش کۆمەڵێـك مـەرج و نیشـانەی گـەورەو گرنگـی هـەن، کـە هـەم نیشـانەو بەڵگـەی بوونینـی و، هـەم مەرجـی وەرگیرانیشـی و، بەشـی چوارەمیشـمان بـۆ تـوێژینەوەیـان تـەرخان کـردوە.

---

(١) بڕوانە: (عمدة القاري شرح صحيح البخاري) ج٢٢، ص٢٨٠.

(٢) بڕوانـە (الآداب الشرعية و المنح المرعيـة) لابـن المفلح المقدسي، ج١، (فصـل: في حقيقـة التوبـة و شـروطها) ص (١٣٦، ١٤٨).
دیارە مـن ئـەم پێناسـەیەم بۆ (التوبة النصوح) لەسـەرجەم دەقەکانی شـەرع و قسـەو پێناسـەی زاناو پێشـەوایانەوە هەڵهێنجاوە، ئەگەرنا (ابن المفلح) دەقی ئەو پێناسـەیەی منی نەهێناوە ئەوەندە هەیـە لێیـەوە نزیکـە.




# مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ و هۆکار و فاکتەرەکانی سەر و بەرگرتنی

١- مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ.
٢- هۆکارو فاکتەرەکانی سەروبەرگرتنی.

**خوێنەری خۆشەویستم!**

ئەم بەشە لە دوو تەوەردا دەخەینەڕوو:

## تەوەری یەکەم: مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ

بەڕێـــزان!

گەڕانەوە بۆ لای خوا بەشێوەیەکی ڕاست و ساغ، بەلای کەمەوە، دوازدە (١٢) مەرجی هەن، کە لە هەمان کاتدا بەڵگەو نیشانەشینی، کە ئەمانەن:

### ١- مسـوڵمـانێتیی:

یەکەمین مەرجی تۆبەی ڕاست و ساغ و وەرگیرانی لەلایەن خوای بە بەزەییەوە، ئەوەیە کە خاوەنەکەی، خاوەن ئیمان و مسوڵمان بێ، ئەگەرنا بابای کافرو هاوبەشدانەر (الکافر والمشرك) هەتا واز لە کوفرو شیرکەکەیان نەهێنن، کە گەورەترین گوناحن و، بەبێ تۆبەی تایبەت، مەحاڵە خوا قەڵەمی لێبوردنیان بەسەردا بێنێ، ڕێی تۆبەکردنیان لە گوناح و تاوانەکانی دیکەیان نیەو لێیان وەرنا گیرێ، خوای دادگەر لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَـٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا ﴾[1] .

---

(١) النساء:١٨.

واتـە: تۆبـە بـۆ ئەوانـە نیـە کـە کـردەوە خراپـەکان دەکـەن، هەتـا کاتێـك کـە مـەرگ یەخـەی بـە یەکێکیـان گـرت بڵـێ: مـن ئێسـتا دەگەڕێمـەوە! هەروەهـا بۆ کەسانێکیش نیـە کـە بەکافرێتیـی دەمـرن، ئەوانـە ئازارێکـی بـە ئێشـمان بۆیـان ئامادەکـردوون.

هەروەهـا فەرموویەتـی: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ ﴾[1] ، واتـە: بێگومـان خوا لـەوە نابـوورێ کـە هاوبەشـی بـۆ دابنـرێ.

بەڵـێ بابای کافرو موشریك، پێویستە بـەر لـە هـەر گونـاح و تاوانێکیـان، تۆبـە لـە کوفرو شیرکەکەیان بکـەن.

## ٢- تەنیا خوا پێ مەبەست بوون (الإخلاص):

خـوا پـێ مەبەسـت بـوون (الإخـلاص)، هەوێنـی هـەر کردەوەیەکـی چاکـەو مـەرجی وەرگیرانیەتـی، خـوای پـەروەردگار فەرموویەتـی:

﴿ فَمَن كَانَ يَرْجُواْ لِقَآءَ رَبِّهِۦ فَلْيَعْمَلْ عَمَلًا صَـٰلِحًا وَلَا يُشْرِكْ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدًۢا ﴾[2].

واتـە: ئنجا هەرکەسێك کـە بـە ئومێدی دیـداری پەروەردگاریەتـی، بـا کـردەوەی بـاش بـکات و، لـە پەرستنی پـەروەردگاری دا، هیـچ کـەس نەکاتـە هاوبـەش.

دیـارە مەسـەلەی قبـووڵ نەکردنـی هیـچ کردەوەیەکـی چـاك، کـە تۆبـە یەکێکیانـە، بە بێ نیازو مەبەست یەکلاکردنەوە بۆ خوا، یەکێکە لە شتە ڕوون و ئاشکرایەکانی ئیسـلام، کـە وێـڕای چەنـدان دەقـی قـورئـان و سـوننەت، یەکدەنگیـی زانایـان (إجماع العلماء)یشـی لەسـەرە، وەك (ابـن حجـر العسـقلاني) لـە (القرطبـي)یەوە هێناویەتـی کـە گوتوویەتـی: (ولا تصح التوبـة الشرعيـة إلاّ بالإخـلاص، و مـن تـرك الذنـب لغير اللـه لايكـون تائبـاً اتفاقـاً)[3]، واتـە: تۆبـەی شـەرعیی بـە بـێ ئیخـڵاص دروسـت نابـێ و،

---

(١) النساء:١١٦.

(٢) الكهف:١١٠.

هـەر کەسێك لەبـەر غـەیـری خـوا واز لـە گـونـاحـان بهێنـی، ئـەوە بـە یـەکـدەنگیـی (زانایـان) بـە تۆبـەکار دانانـرێ.

هەروەهـا (مـلاّ عـلي القـاري) خاوەنـی (شرح الفقـه الأكبر)يـش گـوتوويـەتـی: (فمـن نـدم عـلى شرب الخمـر مثـلاً، لمـا فيـه مـن الـصرع و خفـة العقـل و كـثرة النـزاع والإخلال بالعِـرْض و المـال، لم يكـن تائبـاً شرعيـاً)[1]، واتە: ئنجا کەسێك بۆ وێنە: لـە خواردنـەوەی مـەی پەشـێمان بێتـەوە، لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە لـە خـۆی دەچـێ و عـەقڵـی پێـی سـووك دەبـێ و، زۆر تووشـی کێشـەو هـەرا دەبـێ و، زیـان بـە ئابـڕوو و کەڕامـەت و سـامانی دەگات، ئـەوە لـە ڕووی شـەرعەوە بـە تۆبـەکار دانانـرێ.

## ٣- پەشێمان بوونـەوە (النـدم):

ئەمیـش مەرجێکـی دیکـەی زۆر گـەورەو بنەڕەتیـی تۆبـەی ڕاسـت و سـاغەو، بگـرە کاکڵ و جەوهەریـەتـی، هـەر بۆیـەش پێغەمبـەری خـوا (صلـی اللـه علیـه وسلم) وەك چـۆن لەبـەر گرنگیـی لـە عـەرەفـات وەسـتان (الوقـوف بعرفـة) فەرمـوویـەتـی: {الحَـجُّ عَرَفَـةٌ}[2]، بـە هەمـان شـێوەش فەرموویـەتـی: {النَّـدَمُ تَوْبَةٌ}[3]، واتە: پەشـێمانیی تۆبەیە.

ئنجا (عبـدالله بـن مسـعود) خـوا لێـی ڕازی بـێ، زۆر جـوان چۆنیەتـی پەشـێمانیی و داخ و حەسـرەتی بابـای تۆبەکارمـان پێشـان دەدات، کـە گـوتوويـەتـی: {إِنَّ الْمُؤْمِـنَ يَـرَى ذُنُوبَـهُ كَأَنَّـهُ قَاعِـدٌ تَحْـتَ جَبَـلٍ يَخَـافُ أَنْ يَقَـعَ عَلَيْـهِ، وَإِنَّ الْفَاجِـرَ يَـرَى ذُنُوبَـهُ كَذُبَـابٍ مَـرَّ عَـلَى أَنْفِـهِ}[4]، واتـە: بێگومـان بابـای بڕوادار گوناحەکانـی وادەبینـێ

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج١١، ص١٠٣، کە لە (المفهم)ی (القرطبي)یەوە نەقڵی کردوە.

(٢) بڕوانە: أخرجه الترمذي: ٨٨٩، وأبو داود: ١٤٤٩، والنسائي: (٢٥٦/٥) والحاكم في المستدرك (٢٧٨/٢) وصححه الألباني في سنن النسائي: ٢٨٢٢.

(٣) أخرجه أحمد: ١٨٧٩٦، وأبو داود: ١٩٤٩، والترمذي: ٨٨٩، والنسائي: ٣٠٤٤، وابن ماجه: ٣٠١٥، والحاكم: ٣١٠٠، وقال الحاكم: صحيح.

(٤) أخرجه أحمد: ٤٠١٢، وابن ماجه:٤٢٥٢، قال البوصيري (٢٤٨/٤): هذا إسناد صحيح رجاله ثقات.

کە لە بن شاخێك دانیشتوەو دەترسێ بەسەریدا بڕووخێ، بەڵام بابای بەدکار گوناحەکانی وەك مێشێك تەماشا دەکات، کە بەلای لووتیدا تێپەڕ دەبێ.

## ٤- دەست هەڵگرتن و وازهێنان لەگوناح:

وەك چۆن پەشێمانیی (ندم) مەرجی بنەڕەتیی دیوی پەنهان و دەروونیی تۆبەیە، دەست هەڵگرتن و وازهێنان (إقلاع) لە گوناح و خراپەو تاوانیش، مەرجی ڕواڵەتیی و ئاشکرای تۆبەیەو، لە ڕاستییدا تۆبە بە بێ واز لە گوناح هێنان، هیچ مانایەکی نیەو دەبێتە ناوی بێ نێوەڕۆك، چونکە وەك لە پێناسەی (تۆبە)دا گوتمان: بریتیە لە گەڕانەوە (رجوع)،و گەڕانەوەش هەم لە گوناح گەڕانەوەو، هەم بۆلای خوا بادانەوەو، وەرچەرخانەوەش دەگرێتەوە.

## ٥- دان بە گوناحداهـێنان:

ئەمیش مەرجێکی دیکەی وەرگیرانی تۆبەو، بەڕاست و ساغ لە قەڵەم درانیەتی و، ئەنجام و بەرهەمی ڕاستەوخۆی پەشێمانیی (نَدَم)یشە، دیارە دان بە گوناح و هەڵەدا هێنان (الإعتراف بالذنب)یش، دەبێتە مایەی گوناح پۆشران و لێبوردرانی ئینسان، چونکە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: ((..فإِن العبد إذا اعترف بذنب، ثم تاب، تاب الله عليه))[١]، واتە: بێگومان بەندە هەرکاتێك دانی بە گوناحدا هێنا، ئنجا تۆبەی کرد، ئەوە خوا تۆبەی لێ وەردەگرێ.

## ٦- ئیرادەی پتەو و دڵ دامەزران، لەسەر نەگەڕانەوە سەر گوناح:

بێگومان ئینسان لە ئەنجامی بێ هێزیی ئیرادەو خۆڕانەگرییەوە، تووشی گوناح و لادان دەبێ، وەك خوای زانا لەبارەی (ئادەم)ەوە - عليه السلام- پاش خواردنی لە درەختە قەدەغەکراوەکەو، لە بەهەشت دەرکرانی فەرموویەتی:

---

(١) أخرجه أحمد: ٣٦٢٧، قال الشيخ شعيب الأرناؤوط: إسناده صحيح على شرط الشيخين.

﴿ وَلَقَدْ عَهِدْنَآ إِلَىٰٓ ءَادَمَ مِن قَبْلُ فَنَسِىَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا ﴾[١].

واتە: بێگومـان لەمەوبەر ئادەممان ڕاسپاردبوو (کە لە درەختە قەدەغەکراوەکە نەخوات)، بەڵام لە بیری چوو و (لەو مەسەلەیەدا) دڵ دامەزراوییمان پێوە نەبینی، بەڵێ دامەزراویی نەلە خشاویی ئیرادەی قایم و پۆڵایین، بۆ بانەدانەوە سەر گوناح و سەرپێچیی، یەکێکی دیکەیە لە نیشانەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ و، مەرجێکە لە مەرجەکانی وەرگیرانی.

## ٧- چاکەکاریی و قەرەبووکردنەوەی ڕابردوو:

هەرکەسێك بە ڕاستیی و ساغیی گەڕابێتەوە بۆ لای خوا (تبارك وتعالى)، بێگومـان هـەوڵ دەدات و کۆشش دەکات، کەلێنـی ڕابـردوو پڕبکاتـەوەو زیانـی تێپەڕیـو قەرەبـوو بکاتـەوە، بۆیـە چاکەکاریـی (إصلاح)یـش مەرجێکـی دیکـەی تۆبـەی ڕاسـت و سـاغە، خـوای بـەرزو مەزنیـش لەوبـارەوە فەرموویەتـی:

﴿ وَإِذَا جَآءَكَ ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِـَٔايَـٰتِنَا فَقُلْ سَلَـٰمٌ عَلَيْكُمْ ۖ كَتَبَ رَبُّكُمْ عَلَىٰ نَفْسِهِ ٱلرَّحْمَةَ ۖ أَنَّهُۥ مَنْ عَمِلَ مِنكُمْ سُوٓءًۢا بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ تَابَ مِنۢ بَعْدِهِۦ وَأَصْلَحَ فَأَنَّهُۥ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[٢]

واتـە: هەرکاتێك ئـەو کەسانەت هاتنـە لا، کـە بڕوایان بـە ئایەتەکانمان هەیـە، پێیـان بڵـێ: سـەلامتان لـێ بـێ، پەروەردگارتـان بەزەیـی هاتنـەوەی لەسـەر خـۆی نووسیوە، کـە هەرکامێکتـان بـە نەفامیـی خراپەیـەك بـکات، پاشـان دوای ئـەوە تۆبـە بـکات و چاکەکاریـی بـکات، بێگومـان (خـوا لەگەڵیـدا) لێبـوردەی میهرەبانـە.

---

(١) طه: ١١٥.

(٢) الأنعام: ٥٤.

## ٨- گێڕانەوەی مافی خاوەن مافان و بۆ قەرەبووکردنەوەیان:

ئەمیش مەرجێکی دیکەی گەورەو گرنگی وەرگیرانی تۆبەو، بەڕاست و ساغ دانرانیەتی، ئنجا ئەو هەق و مافانەش بەگشتیی دوو جۆرن:

**یەك:** مافە ماددییەکان.

**دوو:** مافە مەعنەوییەکان.

جاریٚ بۆ مافە ماددییەکان، ئەوە پێویستە بە زووترین کات، بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، یان بۆ میراتگرەکانیان، ئەگەر خۆیان نەمابوون، ئەگەر میراتگرو خزم و خوێشیشیان نەبوو، مافەکانیان بۆ بخاتە خەزێنەی دەوڵەت (بیت المال)ەوە، ئەگەر مسوڵمانان بوویان، ئەگەرنا بۆیان بکاتە خێر.[١]

دیارە ئەگەر توانای دانەوەی ئەو هەق و مافانەشی نەبوو، دەبیٚ هەرچۆن بیٚ خاوەنەکانیان ڕازیی بکات و، گەردنی خۆییان پیٚ ئازاد بکات، ئەگەرنا وەك (حق الناس) هەر لەسەری دەمێنن بۆ قیامەت.

بەڵام ئەگەر مافەکان مەعنەویی بوون، ئەوە پێویستە بابای تۆبەکار، داوای لێبوردن لە خاوەنەکانیان بکات و، گەردنی خۆییان پیٚ ئازاد بکات و، هەرچۆن بووە ڕازییان بکات، ئەگەر بە خۆ خستنە بەردەست و ئامادەیی دەربڕینی تۆڵە لیٚ ستاندنەوەش بیٚ.

ئنجا ئەگەر هات و هەق و مافەکان بە جۆرێك بوون، کە ئەگەر بابای خاوەن ماف پێیان بزانیٚ، زیاتر دڵی پێیان نارەحەت بیٚ، بۆ وێنە: بابای تۆبەکار جۆرە بوختانێکی بۆ کردبیٚ، کە هەتا ئەو کاتە نەیزانیبیٚ و، بەبیستنی زۆر نارەحەت

---

(١) (إبن المفلح) لە (إبن عقيل)ەوە نەقڵی کردوە کە لە کتێبی (الإرشاد)دا گووتویەتی: (ومن شرط صحتها رد المظلمة إلى مالكها إن كان باقياً، أو التصدّق بها، إن كان معدوماً و ليس له ورثة). بڕوانە: (الآداب الشرعية) ج١، ص ١٢٩، واتە: لە مەرجەکانی دامەزرانی تۆبەو دروستبوونی، ئەوەیە کە:
کە مافە زەوتکراوەکە بگێڕێتەوە بۆ خاوەنی ئەگەر مابیٚ، یان کردنە خێری، ئەگەر نەمابیٚ و میراتگریشی نەبن.

بێ، ئەوە چاکتـر وایـە هـەر پێـی نەڵێ و، لـە جیاتـی ئـەوە لـە مـلاولا مەدحـی بـکات و باسـی چاکەکانـی بـکات و، لـە نێـوان خـۆی و خواشـدا، بـۆی بپاڕێتـەوەو دووعـای خێـری بـۆ بـکات[١].

پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی گێڕانـەوەی هـەق و مافـی خـاوەن مافەکانـەوە فەرموویەتـی: {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ مَـنْ كَانَـتْ عِنْـدَهُ مَظْلِمَـةٌ لِأَخِيـهِ فَلْيَتَحَلَّلْـهُ مِنْهَـا، فَإِنَّـهُ لَيْـسَ ثَـمَّ دِينَـارٌ وَلَا دِرْهَـمٌ، مِـنْ قَبْـلِ أَنْ يُؤْخَـذَ لِأَخِيـهِ مِـنْ حَسَـنَاتِهِ، فَـإِنْ لَـمْ يَكُـنْ لَـهُ حَسَـنَاتٌ، أُخِـذَ مِـنْ سَـيِّئَاتِ أَخِيـهِ فَطُرِحَـتْ عَلَيْـهِ}[٢]. واتـە: هەرکەسـێك سـتەمی لـە برایەکـی کـردووەو هەقێکـی لـە سـەریەتی، بـا ئێسـتا گـەردنی خـۆی لێـی ئـازاد بـکات، چونکـە لـەوێ (لـە قیامەتـێ) هیـچ زێـڕو زیوێـك نیـە، لـە چاکەکانـی وی دەدرێتـە برایەکـەی (لـە جیاتـی هەقەکـەی)، ئەگـەر چاکەشـی نەبـوون، لـە خراپەکانـی برایەکـەی وەردەگیرێـن و، فـڕێ دەدرێنـە سـەری!

## ٩- ڕاست ڕاوەستاویی و بەملاولادا، لانەدان:

ئەمیـش مـەرج و نیشـانەیەکی دیکـەی تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ و تـەواوە، دیـارە مەبەسـتیش لـە ڕاسـت ڕاوەسـتاویی (الإسـتقامة) ئەوەیـە کـە بابـای بـۆ لای خـوا

---

(١) بڕوانـە: (الآداب الشـرعية) لابـن المفلـح المقدسـي، ج١، ص(١١٤- ١١٦)، ئنجا (إبـن المفلح) لەوبـارەوە کـە بـاش نیـە لـەو جـۆرە حاڵەتانـەدا بابـای خـاوەن مـاف ئـاگادار بکاتـەوە، سـێ هـۆی هێناونـەوە:

أ - ئەگەر ئاگاداری بکاتەوە دەبێتە مایەی پتر ئازاردانی.

ب - دەگونجـێ بابـای خـاوەن مـاف، زۆر بەزیـادەوە تۆڵـە لـە کابـرای قـەرزدار بکاتـەوەو سـتەمی لـێ بـکات.

ج - دەگونجێ کە ببێتە مایەی نەمانی خۆشەویستیی و دۆستایەتیی نێوان و، پەیدابوونی بوغزو کینەو دوژمنایەتیی.

(٢) أخرجه البخاري: ٦١٦٩

گـەڕاوە (التائـب إلـى الله) ڕێك و ڕاست لەسـەر جادەی شـەرع بڕوات، بە بێ بەزایـەدان و زۆر تێنووسـان (تفریـط و إفـراط).

خـوای کاربەجێ و بـە بەزەیـی فـەرموویەتـی: ﴿ فَٱسۡتَقِمۡ كَمَآ أُمِرۡتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطۡغَوۡاْۚ إِنَّهُۥ بِمَا تَعۡمَلُونَ بَصِيرٞ ﴾[1] .

واتـە: ئنجا (ئـەی موحەممـەد) وەك فەرمانـت پـێ کـراوە، خـۆت و ئەوانـەش کە لەگەڵتدا گەڕاونـەوە (لای خـوا) ڕاسـت ڕاوەسـتاو بن و لـە سنوور دەرمەچـن، بێگومـان ئـەوا (خـوا) بینـەری ئەوەیـە کە دەیکەن.

(سید قطـب)ی شـەهید لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا گوتوویەتـی: (فەرمـان کردن بـە (توبـة)و ئـەوەی کـە لێیـەوە پەیـدا دەبـێ، لـە بێداریـی ویـژدان و سـەغڵەتیی، زۆر جاران سەردەکێشـێ بـۆ تێپەڕانـدن و زیادەڕۆیـی، کـە ئـەم ئایینـە لـە ئاسـانییەوە دەگـۆڕێ بـۆ ڕەحمـەت، دیـارە خـواش دەیـەوێ ئایینەکـەی وەك نادوویەتـە خـوارێ بمێنێتـەوەو، دەیـەوێ ئینسـان لەسـەری ڕاوەسـتاو بـێ، بەبـێ تێپەڕاندن و سـەرکێشـیی، چونکـە تێپەڕانـدن و سـەرکێشـییش، وەك کەمتەرخەمیـی و بەزایـەدان، ئـەم ئایینـە لـە سروشـتی خـۆی دەباتـە دەرێ)[2].

بەڵـێ ئـەم مەرجـەش یەکێکـە لـە مەرجـە گرنـگ و بنەڕەتییەکانـی گەڕانـەوەی ڕاسـت و سـاغ، چونکـە لادان لـە شـەرع و ئایینـی خـوا، هـەر لادانـە بەهـەر بارێکیاندا بـێ و، بابـای گـەڕاوە (تائب)یـش، ئەگـەر لـە خـۆی وریـا نەبـێ، بـە تایبـەت لـە سـەرەتاوە، ڕەنگـە دووچـاری دەردی تێپەڕانـدن (إفـراط) ببـێ، بـە حیسـابی خـۆی بـۆ قەرەبووکردنـەوەی و تێهەڵهێنانـەوە، بـەڵام بێگومـان لـە میشـیاندا وەك حاڵەتـی پێشـوو - کـە بەزایـەدان (تفریـط) بـوو - هـەر بـە دۆڕاوو زیانبـار (خاسـر)و گوناحبـار دادەنـرێ و، لـە جـۆرە گوناحبارییەکـەوە بـۆ جۆرێکـی دیکـەی گواسـتۆتەوە! مـن بـۆ خـۆم لـەو جـۆرە کەسـانەم دیـون، کـە کاتـی خـۆی لـە نەفامیـی و دوور لـە خوایـی و

---

(١) هود: ١١٢.

(٢) في ظلال القرآن ج٤ ص ١٩٣١.

کەمتەرخەمییدا گوزەراندوویانەو، پاشان کە خوا ڕەحمی پێیان کردوەو بێدارو هۆشیاربوونەوە، ئەوجار هێندە بەولادا تێنووساون، تاکو لە سنوورەکانی شەرعیان تێپەڕاندوەو، هی واشم تێدا بینیون کە پاشان لە سۆنگەی ئەو زیاد تێنووسان و خۆ ئەزیەت دان و سنووری شەرع بەزاندن و لادانەدا، دووبارە گەڕاونەوە سەر گومڕاییەکەی پێشوو!! دیارە فیترەت و سروشتی ئینسانیش تەنیا تەحەممولی شەرع و بڕیارە ڕاست و دروست و پڕ بە پێستەکانی دەکات و، لە شەرع لادان هەرچۆن بێ و، بە هەر بارێکدا بێ، هەر دژو پێچەوانەی فیترەتە:

﴿ فَأَقِمْ وَجْهَكَ لِلدِّينِ حَنِيفًا ۚ فِطْرَتَ ٱللَّهِ ٱلَّتِى فَطَرَ ٱلنَّاسَ عَلَيْهَا ۚ لَا تَبْدِيلَ لِخَلْقِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ ٱلدِّينُ ٱلْقَيِّمُ وَلَٰكِنَّ أَكْثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ ﴾(١)

واتە: دەجا ڕووی خۆت ڕاست ڕابگرە بەرەو ئاییني پاك و بێ هەڵە، كە بە پێی ئەو سروشتەیە، خوا خەڵكی لەسەر خوڵقاندوەو، گۆڕانیش بەسەر دروست کراوی خودادا نایەت، ئا ئەوەیە ئاییني ڕێك و ڕاست، بەڵام زۆربەی خەڵکی نازانن.

## ١٠- دەرخستن و ئاشكراكردنی تۆبە، لەو گوناحانەی كە بەئاشكرا كردوونی:

ئەمیش کە مەرج و نیشانەیەکی دیکەی تۆبەی ڕاست و ساغەو، یەکێکە لە مەرجە گەورەو بنەڕەتییەکانی قبووڵ کرانی گەڕانەوە بۆ لای خوا.

**چونکە گوناح و تاوانەکان لە ڕووی پەنهان و ئاشکراییەوە دوو جۆرن:**

**أ-** جۆرێکیان ئینسان بە شاراوەیی کردوونی و، لە نێوان خۆی و خوادان و خەڵکی پێیان نازانن، ئنجا ئەم جۆرە تەنیا ئەو مەرجانەی کە ڕابردن بەسنی بۆ تۆبە لێکردنیان،

**ب-** بەڵام جۆری دووەمیان کە بە ئاشکرا کراون و خەڵك و دەوروبەر پێیان زانیون، ئەوە بێگومان وێڕای مەرجە ڕابردووەکان، ئەم مەرجی دەیەمەشیان پێویستە، بۆ تۆبەی ڕاست و ساغ لێکرانیان.

---

(١) الروم: ٣٠.

بۆ وێنـە: بابایەك كە بە دزیی كردن و ڕێگریی، یان مەیخۆریی، یان داوێن پیسیی، یان بانگەوازكردن بۆ كوفرو شیرك و دژایەتیی كردنی ئیسلام، یان.. هتد، ناسراوەو بە ئاشكرا ئەو گوناح و تاوانەی ئەنجام داوە، ئەوە بێگومان كاتێك تۆبەكەی بە ڕاست و ساغ دادەنرێ و لێ وەردەگیرێ، كە وێڕای مەرجە پێشووەكان، ئەم مەرجەش جێبەجێ بكات و، بە ئاشكراو ڕوونیی و ڕاشكاویی و بێ منگەمنگ، پەشێمانیی خۆی بخاتە ڕوو و ڕایبگەیەنێ كە: هەتا ئێستا لەسەر هەڵەو تاوان بووە، ئێستاش پەشێمانەو بەكردەوە حاڵ و وتاریش پێشانی بدات و، ئیسپاتی بكات كە ڕاست دەكات، سەرنج بدە! چۆن خوای پەروەردگارو كاربەجێ دەربارەی ئەو زانایانەی كە ئایەتەكانی خوایان شاردۆتەوەو بە نرخێكی كەم بە طاغووتەكانیان فرۆشتۆتەوە، خەڵك و میللەتیان بۆ چەواشەكردوون و هەڵخەڵەتاندوون، وێڕای تۆبەو چاكەكاریی (التوبة و الإصلاح)، ڕوونكردنەوەی هەق و ڕاگەیاندنیشی بۆ بە مەرج گرتوون:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَكْتُمُونَ مَآ أَنزَلْنَا مِنَ ٱلْبَيِّنَٰتِ وَٱلْهُدَىٰ مِنۢ بَعْدِ مَا بَيَّنَّٰهُ لِلنَّاسِ فِى ٱلْكِتَٰبِ ۙ أُو۟لَٰٓئِكَ يَلْعَنُهُمُ ٱللَّهُ وَيَلْعَنُهُمُ ٱللَّٰعِنُونَ ﴿١٥٩﴾ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ وَأَصْلَحُوا۟ وَبَيَّنُوا۟ فَأُو۟لَٰٓئِكَ أَتُوبُ عَلَيْهِمْ ۚ وَأَنَا ٱلتَّوَّابُ ٱلرَّحِيمُ ﴾[1]

واتە: بێگومان ئەو كەسانەی ئەوە دەشارنەوە كە ناردوومانەتە خوارێ، لە بەڵگەكان و ڕێڕوونیی پاش ئەوەی لە كتێبی خۆماندا بۆ خەڵكیمان ڕوون كردۆتەوە، ئا ئەوانە خوا لەعنەتیان لێ دەكات و، هەرچی نەفرین كەرە نەفرینیان لێ دەكات، بێجگە لەو كەسانەی كە تۆبەیان كردووەو چاكەكارییان كردووەو (هەقیان) ڕوونكردۆتەوە، ئا ئەوانە مسۆگەر تۆبەیان لێ قبووڵ دەكەم و، من زۆر تۆبە وەرگری بە بەزەییم.

---

(١) البقرة: ١٥٩-١٦٠.

بەڵـێ کەسـێك، بـۆ وێنـە: سـەرکردەو کادری یەکێـك لـە ڕژێمـە طاغووتییـەکان و حیزب و ڕێکخراوە عەلمانییـەکان[1] کاتێك دەعـوای مسـوڵمانەتیی و گەڕانـەوە بـۆ لای خـوای لـێ دەسـەلمێنرێ، کـە بـە قسـەو وتـارو نووسـین و کـردەوەو ڕەفتـاری ڕۆشـن و بێ پێچ و پەناو ڕاشکاو، بە هەڵەداچوونی پێشـووی و گەڕانـەوە سـەرهەقی ئێستاشی ڕابگەیەنێ، تاکـو کـە پێشـتر بەهـۆی ئـەوەوە خەڵکێك کافرو گوناحبار بووەو ڕێیان لـێ بزر بـووە، لەمـەودوا ئـەو خەڵکەو خەڵکی دیکـەش بزانـن و دڵنیـا بـن، کـە ئـەو کابرایـە پێشـتر سـەرگەردان و ڕێ لـێ ون بـوو بـووەو، گیـرۆدەی ڕێچکەیەکی پـووچ بـووە.

ئـەو دە (١٠) مەرجانـەی ڕابردن، تێکڕایـان بـە خـودی تۆبەکـەوە پەیوەسـت بـوون، بـەڵام تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ، دوو مەرجـی دیکەشـی پێویسـتن کـە پەیوەندییـان بەکاتـی تۆبـە تێدا وەرگیرانـەوە هەیـە، ئەمانیـش:

### ١١- دەبێ تۆبە کردن بەر لە کاتی سەرە مەرگ بێ:

خـوای پـەروەردگارو دادگـەر ئـەم مەرجـەی بۆ وەرگیرانی تۆبە، زۆر جوان ڕوونکردۆتـەوەو فەرموویەتـی: ﴿إِنَّمَا ٱلتَّوۡبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَٰلَةٖ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٖ فَأُوْلَٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيۡهِمۡۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمٗا ١٧ وَلَيۡسَتِ ٱلتَّوۡبَةُ لِلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ حَتَّىٰٓ إِذَا حَضَرَ أَحَدَهُمُ ٱلۡمَوۡتُ قَالَ إِنِّي تُبۡتُ ٱلۡـَٰٔنَ وَلَا ٱلَّذِينَ يَمُوتُونَ وَهُمۡ كُفَّارٌۚ أُوْلَٰٓئِكَ أَعۡتَدۡنَا لَهُمۡ عَذَابًا أَلِيمٗا﴾[2].

---

(١) لـە کتێبی: (سۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسیۆنالیزم)دا، لـە بەشی چوارەم: (مسـوڵمانەتیی و کوردایەتیی لـە نێوان ئیسـلامییەکان و عەلمانییەکانـدا) پێناسـەی وشـەو زاراوەی عەلمانییـەت (سـیکۆلاریزم)مان کـردوە، هەروەهـا لـە کتێبـی: (چەنـد مەسـەلەیەکی بـاوی سەردەم)یشـدا بەهەمـان شـێوە، بڕوانـە: چاپـی شەشـەم- نووسـینگەی تەفسـیر. تێبینـی: بـەڵام پێویسـتە بزانـرێ کـە عەلمانییـەکان هەموویـان یـەك جـۆر نیـن و، هەیانـە هـەر لـەڕووی عاتیفیـی و لاساییکردنەوەوە، یـان بەهـۆی ناچاریـی ژیـان و گوزەرانـەوە، خـۆی ناوناوە عەلمانیـی و مـەرج نیـە وەك عەقیـدە وەری گرتبـێ.

(٢) النساء:١٧-١٨.

واتە: بێگومان تەنیا تۆبە وەرگیرانی کەسانێك لەسـەر خوایە (کە بۆ خۆی لەسـەر خۆی پێویستی کردوە) کە بـە نەفامیـی[١] خراپـە دەکـەن و، پاشان زوو[٢] دەگەڕێنەوە، ئنجا ئەوانە خوالێیـان خۆش دەبێ و خواش زانـای کاربەجێیـە، بـەڵام کەسـانێك کـە بەردەوام خراپەکان دەکـەن، هەتـا کاتێك کـە مـەرگ گەیشـتە سـەریەکێکیان دەڵێ: مـن ئێسـتا تۆبـە دەکـەم، هەروەهـا کەسـانێك کـە بـە کافریـی دەمـرن، ئەوانـە تۆبەیـان بۆ نیـە، ئەوانـە ئازارێکی بـە ئێشـمان بۆیـان ئامادەکردوە.

هەروەها خوای دادگەر دەربارەی چۆنیەتی تۆبەکردنی فیـرعەون و هۆی تۆبە لـێ وەرنەگیرانـی، فەرموویەتـی:

﴿ وَجَٰوَزْنَا بِبَنِىٓ إِسْرَٰٓءِيلَ ٱلْبَحْرَ فَأَتْبَعَهُمْ فِرْعَوْنُ وَجُنُودُهُۥ بَغْيًا وَعَدْوًا ۖ حَتَّىٰٓ إِذَآ أَدْرَكَهُ ٱلْغَرَقُ قَالَ ءَامَنتُ أَنَّهُۥ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا ٱلَّذِىٓ ءَامَنَتْ بِهِۦ بَنُوٓاْ إِسْرَٰٓءِيلَ وَأَنَا۠ مِنَ ٱلْمُسْلِمِينَ ﴿٩٠﴾ ءَآلْـَٰٔنَ وَقَدْ عَصَيْتَ قَبْلُ وَكُنتَ مِنَ ٱلْمُفْسِدِينَ ﴾[٣]

---

(١) توێژەرەوانی قورئان لەبارەی مانای وشەی (بجهالة) چەند ڕایەکیان هەیە، بەڵام ئەوەی کە ڕۆچووەکان (الراسخون) لەسەری ڕێککەوتوون، ئەوەیە کە (ابن جریر) گوتوویەتی و هەرکام لە: (الرازي)و (ابن کثیر)و (أبو حیان)یش پشتگیرییان کردوە، (ابن جریر) گوتوویەتی: (المراد بالجهالة کل من عصی الله خطأ أو عمداً، فهو جاهل حتی ینزع عن الذنب)، واتە: مەبەست لە (بە نەفامیی): هەرکەسێك بە هەڵە یان ئەنقەست سەرپێچیی خوا بکات، نەفامە هەتا دەگەڕێتەوە، بڕوانە: (جامع البیان) ج٤، ص(٢٠٢-٢٠٣)، و (مفاتیح الغیب) ج١، ص٤، و (تفسیر القرآن العظیم) ج١، ص ٤٦٣، و (البحر المحیط) ج٣، ص(١٩٧-١٩٨).

(٢) مەبەست لە (من قریب)یش بە ڕای زۆربەی زاناو توێژەوان، پێش سەرەمەرگ (إحتضار)ە، وەك هەرکام لە (الطبري)و (القرطبي)و (ابن الجوزي)و (أبي السعود) گووتویانە: بڕوانە (جامع البیان) ج٤، ص ٢٠٤، و (تفسیر القرطبي) ج٥، ص ٩٢، و (زاد المسیر في علم التفسیر) ج٢، ص ٣٧، و (تفسیر أبي السعود) ج٢، ص١٥٦، بەڵام بێگومانم تۆبەو گەڕانەوە لە گوناح، هەتا زووتر بێ و بە پەلەتر بێت، چاکترو مسۆگەرتر قبووڵ دەکرێ، بۆیەش هەندێك لە زانایان (من قریب)یان بە (في حال الصحة) لێکداوەتەوە، (القرطبي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (إنما صحت التوبة في هذا الوقت لأن الرجاء باق..) بڕوانە (تفسیر القرطبي) ج٥، ص٩٢، واتە: بۆیە لە کاتی ساغییدا تۆبەکەی تەواو لێی وەردەگیرێ، چونکە ئومێدو هیوای ژیانی ماوە..

(٣) یونس: ٩٠-٩١.

واتـە: وەچەی یەعقووبمـان لـە دەریـای -سوور- پەڕاندەوە، ئنجا فیـرعەون و سەربازەکانی لە ڕووی ستەم و دوژمنایەتییەوە، شوێنیان کەوتن، هەتا کاتێك کە خەریك بوو (فیرعەون) بخنکێ، گوتی: بڕوام هێنا کە هیچ پەرستراوێك نیە جگە لەو زاتەی وەچەی ئیسرائیل ئیمانیان پێی هەیەو، من لە مسولْمانانم، (خوا پێی فەرموو) ئنجا ئێستاکە بڕوا دێنی (کە چارەت نەماوە) لە حالێکدا کە لەوەپێش سەرپێچییت دەکردو لە تێکدەران بووی؟!!

پێغەمبەری خواش (صلی اللە علیە وسلم) لەوبارەوە کە تۆبە لەکاتی گیانەڵاو سەرەمەرگدا قبووڵ نیە، فەرموویەتی: {عَنْ ابْنِ عُمَرَ عَنْ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ إِنَّ اللَّهَ يَقْبَلُ تَوْبَةَ الْعَبْدِ مَا لَمْ يُغَرْغِرْ}(١)، واتە: بێگومان خوا تۆبەی بەندەکەی قبووڵ دەکات، مادام گیانی هەر لەنێو جەستەیدا بێ و نەگەیشتبێتە حالەتی غەرغەرە کردن {مەبەست ڕووح گەیشتنە گەروو و کاتی گیان کێشرانە}.

## ١٢- پێویستە بەر لەکاتی خۆر گەڕانەوەو هەڵهاتنی لە ڕۆژهەڵاتەوە بێ:

ئەمیش مەرجێکی دیکەی وەرگیرانی تۆبەیەو، هەرکاتێك خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵهات، ئەمە یەکێکە لە نیشانە گەورەکانی کۆتایی هاتنی ژیانی دنیاو دەست پێکردنی هاتنی قیامەت و، تۆبەی هیچ کەس وەرناگیرێ، پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: مَنْ تَابَ قَبْلَ أَنْ تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا تَابَ اللَّهُ عَلَيْهِ}(٢)، واتە: هەرکەسێك بەر لەوەی خۆر لە ڕۆژئاوە هەڵبێ تۆبە بکات، خوا لێی خۆش دەبێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ٦٤٠٨، والترمذي: ٣٥٣٧، وقال: حسن غريب، وابن ماجه: ٤٢٥٣، وابن حبان: ٦٢٨.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٧٠٣، وابن حبان: ٦٢٩.

دیـارە حیکمەتـی ئـەوەش کـە تۆبەکـردن و گـەڕانـەوەی کاتـی گیانـەڵاو دەمـی خـۆر لـە ڕۆژئـاواوە هەڵهاتـن، وەرناگیـرێ، ئەوەیـە کـە ژیانـی دنیـا تاقیـگای ئینسـانەو دەرفەتـی ئیمـان هێنـان و نەهێنـان و چاکەکاریـی و خراپەکاریی، هەیـە، بـەڵام لـە کاتـی ڕووح دەرچـوون و لـە دەمـی خـۆر گـەڕانـەوەدا، ئـەو هـەل و دەرفەتـی تاقیکردنـەوە (إمتحان)یـە بەسـەر دەچـێ، لـە حاڵـەتی گیانـەڵادا، هـی ئـەو ئینسـانە کـە خەریکـی گیـان سپاردنەو، لـە حاڵەتـی خۆرگەڕانەوەشـدا، هـی سـەرجەم مرۆڤایەتیـی!

لـە ڕاستییدا ئیمـان هێنـان و گـەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، لـەو دوو حاڵەتـەدا، هیچ ئازایەتیـی نیـەو دەبێتـە شـتێکی ناچاریـی، وەك پێغەمبـەری خـوا (صلـی اللـە علیـە وسلم) فەرموویەتـی: {عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رَضِيَ اللَّـهُ عَنْـهُ أَنَّ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ قَـالَ لَا تَقُـومُ السَّـاعَةُ حَتَّـى تَطْلُـعَ الشَّـمْسُ مِـنْ مَغْرِبِهَـا، فَـإِذَا طَلَعَـتْ فَرَآهَـا النَّـاسُ آمَنُـوا أَجْمَعُـونَ}[1] ، واتـە: قیامـەت نایـەت هەتـا خـۆر لـە ڕۆژئـاواوە هەڵنەیـەت، ئنجـا ئەگـەر هەڵهـات و خەڵکـی بینییـان، تێکڕا ئیمـان دێنـن.

ئنجـا لـە کۆتایـی ئـەم تـەوەری یەکەمـەی بەشـی چوارەمـدا -کـە وەك پێشـتر گوتمـان بەشـێکی گرنگـی باسـی تۆبـەو گەڕانـەوە بـۆ لای خوایـە- بـە پێویسـتی دەزانـم، وەڵامـی پرسـیارێکی گرنـگ بدەمـەوە کـە بریتیـە لـە:

ئایا نەگەڕانەوە سەر گوناح، مەرجە بۆ وەرگیرانی تۆبە؟!

زانایان لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا، دوو ڕایان هەیە:

هەندێکیـان کـە (معتزلة)شـیان لـە نێـودان دەڵێـن: نەگەڕانـەوە سـەر گونـاح مەرجێکـی دیکـەی وەرگیرانـی تۆبەیـەو، هەرکەسـێك پـاش تۆبەکـەی گەڕایـەوەو بایدایـەوە سـەر ئـەو گونـاح و خراپانـەی کـە تۆبـەی لێیـان کـردوە، ئـەوە سـەرجەم ئـەو گونـاح و خراپـەو تاوانانـەی پێشـووش، کـە تۆبـە لێکردنەکەیانـی شـکاندوە،

---

(١) أخرجه البخاري: ٦١٤١، ومسلم:١٥٧.

دووبـارە لـە لیسـتەی کـردەوە خراپەکانیدا تۆمـار دەکرێنـەوە، ئنجا خاوەنـی ئـەم ڕایـە بەگشـتیی دوو بەڵـگان بـۆ ئیسـپاتی ڕایەکەیـان دێننـەوە:

**یەك:** دەڵێن: تۆبە لە گوناحان، وەك مسوڵمان بوونی بابای کافر وایە، کە کوفرەکەی و ئەو گوناح و تاوانانەی کە بەرهەمی بوون لە کۆڵی دەبنەوەو، هەر کاتێك کافر بۆوەو هەڵگەڕایەوە، ئیمانەکەیشی هەڵدەوەشێتەوەو کردەوە چاکەکانیشی بەتاڵ دەبنەوە، بابای تۆبەکاریش بەهەمان شێوەیەو بە تۆبەکەی گوناحەکانی دەسڕێنەوەو، بە شکاندنی تۆبەکەیشی دووبارە لە سەری کەڵەکە دەبنەوە.

**دوو:** ئەم فەرموودەیەش بە بەڵگە دێننەوە[1]: {عَنْ ابْنِ مَسْعُودٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ قَالَ رَجُلٌ يَا رَسُولَ اللَّهِ أَنُؤَاخَذُ بِمَا عَمِلْنَا فِي الْجَاهِلِيَّةِ قَالَ مَنْ أَحْسَنَ فِي الْإِسْلَامِ لَمْ يُؤَاخَذْ بِمَا عَمِلَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَمَنْ أَسَاءَ فِي الْإِسْلَامِ أُخِذَ بِالْأَوَّلِ وَالْآخِرِ}[2]، واتە: پیاوێك گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئایا بەوەی کە لە نەفامێتییدا کردوومانە، سزا دەدرێین؟ فەرمووی: هەرکەسێك لە ئیسلامەتییدا چاکەکار بێ، لەسەر کردەوەی نەفامێتیی لێی ناپرسرێتەوە، بەڵام هەرکەسێك لە ئیسلامەتیدا خراپە بکات، ئەوە لەسەر گوناحەکانی پێشوو و دوایی سزا دەدرێ.

بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان کـە بـە جەمـاوەری مسـوڵمانان ناسـراون، دەڵێـن: نەگەڕانـەوە سـەر گونـاح، مەرجـی وەرگیرانـی تۆبـەو سـڕانەوەی ئـەو گونـاح و خراپـەو هەڵانـە نیـە، کـە تۆبەیـان لـێ کـراوە، بەڵـکو هـەر تۆبەیـەك ئـەو مەرجانـەی کـە ڕابـردن، تێیـدا بـن، خـوا وەری دەگـرێ و، ئـەم دوو بەڵگەیـەش بـۆ ئیسـپاتی ڕایەکەیـان دێننـەوە:

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري شرح صحيح البخاري) ج١٢، ص ٢٦٥، كتاب: إستتابة المرتدين و المعاندين وقتالهم.

(٢) أخرجـه أحمـد: ٣٨٨٦، قـال الشيـخ شـعيب الأرنـاؤوط: إسـناده صحيـح علـى شـرط الشـيخين.

**یەکەم:** هەموو ئەو ئایەت و فەرموودانەی کە باسی تۆبە وەرگیران دەکەن، هیچ کامیان ئەو مەرجەی تێدا نیە کە نابێ بابای تۆبەکار پاش تۆبەکەی دوچاری هەڵەو گوناح ببێتەوە، بەڵکو بە موتڵەقیی گفت وبەڵێنی لێبوردن و تۆبە وەرگرتنی بابای تۆبەکاریان تێدایە، بۆ وێنە سەرنجی ئەم دەقانە بدە:

١- ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ ﴾[١]، واتە: (خوا) گوناح پۆش و تۆبە وەرگرە، دیارە هەرکام لە وشەی (غافر)و (قابل)یش، دەلالەت لەسەر بەردەوامیی دەکەن، چونکە ناوی بکەر (إسم الفاعل)ن.

٢- ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٞ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحٗا ثُمَّ ٱهۡتَدَىٰ ﴾[٢]، واتە: بێگومان من زۆر لێبوردەم بۆ هەرکەسێك بگەڕێتەوەو ئیمان بهێنێ و کردەوەی باش ئەنجام بدات و، پاشان بە ڕێی ڕاستدا بڕوات.

٣- {وَيَتُوبُ الله عَلَى مَنْ تَاب}[٣]، واتە: هەر کەسێك بگەڕێتەوە بۆ لای خوا، دەگەڕێتەوە سەری (بە بەزەیی و لێبوردنیەوە).

٤- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فِيمَا يَحْكِي عَنْ رَبِّهِ عَزَّ وَجَلَّ قَالَ أَذْنَبَ عَبْدٌ ذَنْبًا فَقَالَ اللَّهُمَّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: عَبْدِي أَذْنَبَ ذَنْبًا، فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، ثُمَّ عَادَ فَأَذْنَبَ، فَقَالَ: أَيْ رَبِّ اغْفِرْ لِي ذَنْبِي، فَقَالَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى: أَذْنَبَ عَبْدِي ذَنْبًا فَعَلِمَ أَنَّ لَهُ رَبًّا يَغْفِرُ الذَّنْبَ وَيَأْخُذُ بِالذَّنْبِ، اعْمَلْ مَا شِئْتَ فَقَدْ غَفَرْتُ لَكَ}[٤]، واتە: بەندەیەك گوناحی کرد ئنجا گوتی: ئەی خوایە! لە گوناحەکەم ببوورە، خوای پایەدارو بەرزیش فەرمووی: بەندەکەم گوناحێکی کردو زانی

---

(١) غافر:٣.

(٢) طه:٨٢.

(٣) أخرجه البخاري: ٦٠٧٢، ومسلم:١٠٤٩.

(٤) أخرجه مسلم: ٢٧٥٤.

کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح دەبوورێ و، لەسەر گوناحیش سزا دەدات، پاشان دووبارە گەڕایەوەو گوناحی کردو گوتی: ئەی پەروەردگارم! لە گوناحەکەم خۆشبە، خوای پایەدارو بەرزیش، فەرمووی: بەندەکەم گوناحی کردو زانیشی کە پەروەردگارێکی هەیە لە گوناح دەبوورێ و، لەسەر گوناحیش سزای هەیە، ئنجا دیسان بایدایەوەو گوناحی کردو گوتی: ئەی پەروەردگارم! لە گوناحەکەم ببوورە، خوای پایەدارو بەرزیش فەرمووی: بەندەکەم گوناحی کردو زانی کە پەروەردگارێکی هەیە، لە گوناح خۆش دەبێ و، لەسەر گوناحیش سزا دەدات، چی دەتەوێ بیکە (مادام هەمیشە تۆبە بکەی) ئەوە لێت خۆش بووم.

(النَّـووي) لـە شـەرحی ئـەم فەرمایشـتە قودسـییەدا نووسـیویەتی: (الحديـث ظاهـر الدلالـة أنـه لـو تكـرر الذنـب مائـة مـرة أو ألـف مـرة، أو أكثر وتـاب في كل مـرة، قُبـل توبتـه وسـقطت ذنوبـه، ولـو تـاب عـن الجميـع توبـة واحـدة بعـد جميعهـا صحـت توبتـه)[1]، واتـە: ئـەم فەرمووودەیـە بـە ئاشـكرا ئـەوە دەگەیـەنێ کـە ئەگـەر گونـاح سـەد (١٠٠) جـار، یـان هـەزار (١٠٠٠) جـار یـان زیاتریـش دووبـارە بێتـەوەو، هەمـوو جارێکیـش تۆبـە بـکات، ئـەوە تۆبەکـەی وەردەگیـرێ و گوناحەکانیشـی لادەچـن، هەروەهـا ئەگـەر لـە جیاتـی هەمـوو جارەکانیـش و، بـۆ هەمـوو گوناحـەکان یـەك تۆبـەش بـکات، ئـەوە تۆبەکـەی هـەر دروسـت و تـەواوە.

**دووەم:** ئنجا بۆ وەڵامی ئەو دوو بەڵگەیەش کە (معتزلة)و هاوبیرەکانیان بۆ ئیسپاتی دەعوای خۆیانیان هێناون، دەڵێین:

**یەك:** بێگومان ئیمان هێنان و تۆبەکردن لە لایەك و، هەڵگەڕانەوە (إرتداد)و تۆبە شکاندن لە لایەکی دیکەوە، لە یەك جیان و، ناگونجێ و قیاس بکرێنەسەر یەکدی، چونکە دەقی قورئان و سوننەت لەسەر ئەوە هەن، کە ئیمان کوفر دەسڕێتەوەو تۆبەش گوناح لادەبات و، دەقیش هەن، کە کوفرو شیرك و هەڵگەڕانەوەش، ئیمان و چاکەکان

---

(١) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١٧، ص ٧٥.

لادەبات و هەڵدەوەشێنێتەوە! بەڵام هیچ دەقێك نیە لەسەر ئەوە كە تۆبە شكاندن و گەڕانەوە سەرگوناح، چاكەكان هەڵدەوەشێنێتەوەو، گوناحەكانیش دووبارە دێنێتەوە!

بە كورتیی: خوای دادگەرو بەخشەر فەرموویەتی: ﴿إِنَّ ٱلۡحَسَنَٰتِ يُذۡهِبۡنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِۚ ..﴾[1]

واتە: بێگومان چاكەكان خراپەكان دەسڕنەوەو لادەبەن، بەڵام (إن السیئات یذهبن الحسنات) نیەو نەهاتوە[2].

**دوو:** ئەو فەرموودەیەش كە هێناویانەتەوە، هەرچەندە ڕاست و ڕەوانەو هیچ ئیشكالی تێدا نیە، بەڵام مەبەست پێی هەڵگەڕانەوە (إرتداد)و كافر بوونەوەیە، نەك گوناحباریی، چونكەوشەی (أساء في الاسلام) هەرچەندە بە موتڵەقیی هاتوە، بەڵام سیاقی فەرموودەكەو گەلێك دەقی دیكەی قورئان و سوننەتیش ناچارمان دەكەن كە بڵێین: مەبەست لە (أساء) كافربوونەوەیە، كە بێگومان (السيئة المطلقة)ش هەر ئەوەیە! دیارە هەر بۆیەش (بخاري) ڕەحمەتی خوای لێبێت ئەو فەرموودەیەی لە ژێر ئەم ناو ونیشانەدا هێناوە:

(كتاب إستتابة المرتدين والمعاندين وقتالهم، و إثم من أشرك بالله وعقوبته في الدنيا والآخرة)[3].

**سێ:** ئنجا ئەگەر هاتباو گوناح نەكردنەوە، مەرجی وەرگیرانی تۆبە بووایە، دەبووایە بڵێین: هەركەسێك تۆبەی كرد، دەبێ پاش تۆبەكردنەكەی پارێزراو (معصوم) بێ!!

---

(١) هود: ١١٤.

(٢) (ابن عقيل) گوتوویەتی: (لا تحبط طاعة بمعصية إلا ما ورد في الاحاديث الصَّحيحة فيَتَوقَّفُ الإحباط على الموضوع الذي ورد فيه و لا نقيس عليه) بڕوانە (الآداب الشرعية) ج١، ص١٨٠، واتە: چاكە بە گوناح لا ناچێ، مەگەر چەند شتێك كە لە فەرموودە ڕاستەكاندا هاتوون، ئنجا هەڵوەشانەوەی كردەوەی چاك بە گوناح، تەنیا تایبەتە بەو حاڵەتانەوە كە دەقیان دەربارە هاتووە نابێ حاڵەتی دیكەیان قیاس بكرێتە سەر.

(٣) بڕوانە: (فتح الباري) ج١٢، ص ٢٦٥، رقم الحديث: ٦٩٢١.

بەڵام ئاشكرایە كە زانایان لەسەرئەوە یەكدەنگن كە جگە لە پێغەمبەران -علیهم الصلاة والسلام- هیچ كەس لە هەڵەو گوناح پارێزراو نیە.

**چوار:** پاشان دەڵێین: ئەگەر گریمان دەقەكانی دیكەی قورئان و سوونەتیش ڕاجیایی (إختلاف) و مشت و مڕی زاناو پێشەوایان هەڵبگرن، ئەوە بێگومان فەرموودە قودسییەكەی كە ڕابردو (مسلم) لە (أبو هريرة) وە هێناویەتی، هیچ ئیشكالێك لەو ڕووەوە ناهێڵێ و، دەق (نص)ە لە جێگای تێك گیراندا (نصٌّ فـي محل النزاع)، چونكە خوای پەروەردگارو بەخشندە بە ڕوونیی و ڕاشكاویی لە جاری[1] سێیەم یان چوارەمدا، بە بەندە گوناحبارە تۆبەكارەكەی خۆی فەرمووە: (إعمل ماشئت فقد غفرت لك) دیارە دوای فەرمایشتی خواو پێغەمبەركەیشی (صلى الله عليه وسلم) هیچ كەس قسەی نامێنێ.



(١) (عبد الأعلى) كە یەكێكە لە ڕاوییەكانی ئەم قسەیەی كردوە.

## تەوەری دووەم:

## فاکتەرو هۆکارەکانی سـەرگرتنی تۆبەی ڕاست و ساغ

خوێنەری بەڕێـــز!

دوای ئـەوەی لـە تـەوەری یەکەمـدا، باسـی مـەرج و نیشـانەکانی تۆبـەو بـۆ لای خـوا گـەڕانـەوەی ڕاسـت و سـاغ (التوبـة النّصوح)مـان کـرد، جێـی خۆیەتـی لـەم تـەوەری دووەمەشـدا، باسـی ئـەو هـۆکارو فاکتـەرە سـەرەکییانە بکەیـن، کـە یارمەتیـی بابـای تۆبـەکار (تائـب) دەدەن، تۆبەکـەی سـەریش بگـرێ و بەریـش بگـرێ! کـە ئـەم حەوتـەن:

### ١- هەوڵدان بۆ هەرچی زیاتر لە خوا نزیکبوونەوەو دامەزراندنی ئیمان:

وەك چـۆن کوفـرو لـە خـوا دوورکەوتنـەوە، مایـەی گونـاح و تـاوان و هـەر نەگبەتیـی و مەینەتییەکـە، ئیمـان و لـە خـوا نزیـك بوونـەوەش، چاوگـی هەمـوو چاکـەو نیعمـەت و خێـرو خۆشـیی و سـەربەرزییەکە لـە دنیـاو قیامەتـدا.

هەربۆیـەش پێغەمبـەری خـوا (صلى الله عليه وسلم) خـوای پـەروەردگار لەسـەر زمانـی فەرموویەتـی: ﴿ فَفِرُّوٓاْ إِلَى ٱللَّهِۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ٥٠ وَلَا تَجۡعَلُواْ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَۖ إِنِّي لَكُم مِّنۡهُ نَذِيرٞ مُّبِينٞ ﴾[1]

واتـە: دەجـا بـەرەو خـوا ڕابکـەن، بێگومـان مـن لـەوەوە بـۆ ئێـوە ترسـێنەرو بێدار کەرەوەیەکـی ئاشـکرام و، هیـچ پەرسـتراوی دیکـە ڕەگـەڵ خـوا مەخـەن، چونکـە مـن لـەوەوە بـۆ ئێـوە، ئـاگادار کەرەوەیەکـی ئاشـکرام.

---

(١) الذاريات: ٥٠-٥١.

ئنجا وەك چۆن پلیتەی چرا بەهۆی نەوت و سووتەمەنییەك كە تێكراوە، دەگرێ و شوعلەی هەیە، ئیمانیش بەهۆی بەندایەتیی بۆ خواو فەرمانبەریی بۆ كردنی و، پابەندیی بە ئایین و شەریعەتەكەیەوە، گەشەو زیاد دەكات و بە پێچەوانەشەوە، وەك چرای بێ نەوت، دەكەوێتە پڵتە پڵت و خەفەو بێ شەوق دەبێ و...هتد[1].

## ٢- دوورە پەرێزیی لە برادەری خراپ و، دووركەوتنەوە لە شوێنی تێدا گوناحبار بوون:

هەم دۆست و برادەری خراپ و، هەم ژینگەو دەوروبەری خراپ و گەندەڵ، گەورەترین كاریگەرییان هەیە لەسەر پەلكێش كردنی مرۆڤ بەرەو گوناح و خراپە، دیارە دۆست و هاوەڵ و دەوروبەری چاك و پاكیش، بە پێچەوانەوە باشترین هۆكارو دەستبارگری ئینسانن بۆ خواپەرستیی و چاكەكاریی.

بێگومان بابای تازەگەڕاوە بەرەو خواو، دەست لە خراپە هەڵگرتوو و دەست بە چاكەو طاعەت كردووش، وەك نەخۆشی تازە هەڵساوە، دەبێ زۆر هۆشیارو بێدار بێ و خۆی بپارێزێ، چونكە ڕەنگە بە پشووە بایەكی شوبهەیەك و بە كزە بایەكی شەهوەتێك، وەزعی تێك بچێ و ڕیسی تۆبەكەی ببێتەوە بە خوریی!

خوای بەرزو مەزن دەربارەی كاریگەریی سەلبیی دۆست و برادەری شووم و بەدفەڕ، دەفەرموێ: ﴿ وَيَوْمَ يَعَضُّ ٱلظَّالِمُ عَلَىٰ يَدَيْهِ يَقُولُ يَٰلَيْتَنِى ٱتَّخَذْتُ مَعَ ٱلرَّسُولِ سَبِيلًا ﴿٢٧﴾ يَٰوَيْلَتَىٰ لَيْتَنِى لَمْ أَتَّخِذْ فُلَانًا خَلِيلًا ﴿٢٨﴾ لَّقَدْ أَضَلَّنِى عَنِ ٱلذِّكْرِ بَعْدَ إِذْ جَآءَنِى ۗ وَكَانَ ٱلشَّيْطَٰنُ لِلْإِنسَٰنِ خَذُولًا ﴾[2]

---

(١) لە كتێبی: (ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون)دا بەشێكی سەربەخۆمان بۆ ئەو بابەتە تەرخان كردوە بەناوی: (توێشووی ڕێگا: بە چی بەرەو خوا بچین؟)، بڕوانە: چاپی شەشەم، نووسینگەی تەفسیر.

(٢) الفرقان:٢٧-٢٩.

واتـە: ئـەو ڕۆژە (بێنـە بەرچـاو) کـە بابـای سـتەمکارو گوناحبـار هـەردووك دەستی خۆی دەگـەزێ، دەڵـێ: خۆزگـە لەگـەڵ پێغەمبـەردا ڕێگام گرتبایەبەر، هـەی هـاوار بۆ مـن! بریـا فلانەکەسم بە دۆست نەگرتبایە، چونکـە بێگومـان لـە (یـاد و، کتێبـی خوا) لایدام، پـاش ئـەوەی بۆم هـات، شـەیطانیش زۆر پشتی مرۆڤ بـەردەدات لـە تەنگانـەدا.

هەروەهـا پێغەمبـەری خواش (صلی اللـه علیـه وسـلم) لـەو فەرموودەیـەدا کـە (بخـاري)و (مسـلم) لـە (أبـو موسـى الأشـعري)یەوە دەیگێڕنـەوە بـرادەری چـاك، وەك میسـك فـرۆش و، هـی خراپیـش، وەك ئاسـنگەرو کوورەچیـی دادەنـێ، کـە ئەمـە دەقەکەیەتـی: (إنــما مَثَـلُ الجليـس الصالـح والجليـس السـؤ، كحامـل المِسـك ونافـخ الكيــر، فحامـل المسـك إمـا أن يُحْذِيَـكَ، واما أن تَبْتـاع منـه، وإمـا أن تجِـدَ منـه ريحـاً طيِّبـةً، ونافـخ الكيــر إمـا أن يُحـرق ثيابـك، وإمـا أن تجـدَ ريحـاً خبيثـةً)، بخـاري: ٥٥٣٤، مسـلم: ٢٦٢٨.

لەبارەی بەجێهێشتنی ژینگەو دەوروبەری خراپیشـەوە، ئـەو فەرموودەیە زۆر بـاوە کـە البخـاري: ٥٤، ومسـلم:٣٤٧٠، لـە (أبـو سـعيد الخدري)یـەوە گێڕاویەتـەوەو، باسـی پیاوێك دەکات کـە نـەوەدو نـۆ (٩٩) کەسـی کوشتوەو، دەیەوێ تۆبە بـکات و سـەرەتا دەچێتـە لای ڕاهیبێـك و پێـی دەڵـێ: ئایـا ڕێـی تۆبـەم هەیـە؟! ئەویـش دەڵـێ: نـەء! کابـرا ئەویـش دەکـوژێ و سـەد (١٠٠) تـەواو دەکات! پاشـان دەچێتـە لای زانایـەك و پـاش ئـەوەی زانایەکـە بۆی ڕوون دەکاتـەوە، کـە دەرفەتـی تۆبـەی هەیـەو، تۆبـە دەکات، زانایەکـە ئامۆژگاریـی دەکات و پێـی دەڵـێ: (إنطلـق إلى أرض كـذا وكـذا فـإن بهـا أناسـاً يعبـدون اللـه، فاعبـد اللـه معهـم ولا ترجـع إلــى أرضـك فإنهـا أرض سـوء)، واتـە: بچۆ بۆ فلانـە سـەرزەمینەی ئـاواو ئـاوا، چونکـە کەسـانێکی لـێ هەن خـوا دەپەرستن، تـۆش خوایـان لەگـەڵ بپەرستە، بـەڵام نەگەڕێیـەوە شـوێنی خـۆت، چونکـە شـوێنێکی خراپـە[1].

---

(١) بڕوانـە: (الآداب الشـرعية) لابـن المفلـح، ج١، ص(١١٩-١٢٠)، (فصـل: فيمـا علـى التائـب مـن فعـل العبـادات ومفارقـة قريـن السـوء ومواضـع الذنـوب).

## ٣- لە شەیتان وریابوون و لەخۆ پرسینەوە:

ئەمیش هۆکارو فاکتەرێکی یەکجار پێویست و گرنگە، بۆ پارێزرانی بابای تۆبەکار لـە خلیسـکان و دووبـارە گیـرۆدە بوونـەوەی گونـاح و تـاوان، جـارێ شـەیتانی بەدفـەڕ، بێگومـان وەچـەی ئـادەم، لـە شـەیتان دوژمنـی سەرسـەختتریان نیـە، خـوای میهرەبـان فەرموویەتـی:

﴿ إِنَّ ٱلشَّيْطَٰنَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَٱتَّخِذُوهُ عَدُوًّاۚ إِنَّمَا يَدْعُواْ حِزْبَهُۥ لِيَكُونُواْ مِنْ أَصْحَٰبِ ٱلسَّعِيرِ ﴾(١)

واتـە: بێگومـان شـەیطان دوژمنتانـە، دەجـا ئێـوەش بـە دوژمنـی بزانـن و دژایەتیـی بکەن، بێگومـان ئـەو پێڕەکەی بۆ ئەوە بانگ دەکات کە ببنە خاوەنی کڵپە (دۆزەخ)ی.

بۆ شـەڕو خراپەو مەترسیی نەفسیش، ئەوەندە بەسـە کە پێغەمەبەرێکی پاك و چاکی وەك (يوسف بن يعقوب بن إسحاق بن إبراهيم) -عليهم الصلاة والسلام- لەوبـارەوە دەفەموێ:

﴿ وَمَآ أُبَرِّئُ نَفْسِيٓۚ إِنَّ ٱلنَّفْسَ لَأَمَّارَةُۢ بِٱلسُّوٓءِ إِلَّا مَا رَحِمَ رَبِّيٓۚ إِنَّ رَبِّي غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾(٢)

واتـە: نەفسـی خۆشـم بەبێ هەڵـەو پەڵـە ناگـرم، چونکـە بێگومـان نەفـس زۆر فەرمـان بـە خراپـە دەکات، مەگـەر کەسێك پەروەردگارم بە بەزەیی خۆی لـە خراپـەی چەپاڵـەی بدات.

ئنجـا هەرچـی شـەیتانە، تەنهـا چەکێـك کـە بتوانیـن پێـی لەگەڵـی بەرەنـگار ببینـەوە، چـاك بەنـدەی خوابـوون و، هانـاو پەنـا بردنـە بـەر خـواو خـۆ پـێ لـێ پاراسـتنی خوتخوتـەو دنەدانـی پیـس و بەدیەتـی، وەك خوای بەخشـندە فەرموویەتـی:

﴿ وَإِمَّا يَنزَغَنَّكَ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ نَزْغٞ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِۚ إِنَّهُۥ سَمِيعٌ عَلِيمٌ ﴾(٣)

---

(١) فاطر:٦.

(٢) يوسف:٥٣.

(٣) الأعراف:٢٠٠.

واتـە: هـەر کاتێـك لـە شـەیتانەوە نقورچکـەی خوتخوتەیەکـت لێگیـرا، ئـەوە یەکسـەر پەنـا بـەرە بـەر خـوا، بێگومـان ئـەو بیسـەری زانایـە[١].

بۆ نەفسیش کاریگەرترین چەك: سەرکۆنەکردن و لێپرسینەوەو مەرزەم کردن و جڵەو توند کردنیەتی و، خوای پەروەردگار گفت و بەڵێنی داوە بە هەرکەسێك کە نەفسی لە ئارەزوو و داخوازییە ناڕەواکانی بگێڕێتەوەو، لە جوغزی شەرعدا کۆنترۆڵ (ضبط)ی بکات و، لەسەر جادەی هیدایەت ڕاوەستاوی بکات و، بە بەهەشتی ڕازاوەو نەبڕاوەی شاد بکات:

﴿ وَأَمَّا مَنْ خَافَ مَقَامَ رَبِّهِۦ وَنَهَى ٱلنَّفْسَ عَنِ ٱلْهَوَىٰ ﴿٤٠﴾ فَإِنَّ ٱلْجَنَّةَ هِىَ ٱلْمَأْوَىٰ ﴾[٢]

واتە: بەڵام هەرکەسێك لە پلەو پایەی پەروەردگار بترسێ و، نەفسی لە ئارەزووەکان بگێڕێتەوە، ئەوە مسۆگەر بەهەشت جێگاو مەنزڵگایەتی[٣].

## ٤- بەردەوام بوون لەسەر پەشێمانیی و داوای لێبوردن لە خوا کردن:

ئەمیش دەستەبەر کەر (ضامن)ێکی یەکجار گەورەو بنەڕەتییە، بۆ لەسەر جادەی هەق مانەوەی بابای بۆ لای خوا گەڕاوە (التائب إلى الله)و نەخلیسکانی و لانەدانی، ئنجا نیشانەی بەردەوام بوون لەسەر ئەو پەشێمانییەش، بریتیە لە داوای لێبوردن لە خوا کردنی بێ پسانەوە، چونکە ئینسان کە هەستی کرد گوناحبارو خەتابارە، دیارە داوای لێبوردنیش دەکات، خوای گوناحپۆش فەرموویەتی:

---

(١) لە کتێبی یەکەمی مەوسووعەی: (خوا پەرستیی ئیسلامیی)دا، جوان باسی چۆنیەتی بەرهەڵستییکردنی خوتخوتەو فێڵ و پیلانی شەیتانمان کردوە، بڕوانە: چاپی دووەم/ نووسینگەی تەفسیر.

(٢) النازعات: ٤٠-٤١.

(٣) لە (ڕێگای صاڵح بوون..)دا بە تێرو تەسەلیی، باسی چۆنیەتی و هۆکارەکانی تەزکیەی نەفسمان کردوە.

﴿ وَالَّذِينَ إِذَا فَعَلُوا فَاحِشَةً أَوْ ظَلَمُوا أَنفُسَهُمْ ذَكَرُوا اللَّهَ فَاسْتَغْفَرُوا لِذُنُوبِهِمْ وَمَن يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا اللَّهُ وَلَمْ يُصِرُّوا عَلَىٰ مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ ﴾[1] .

واتـە: ئـەو كەسـانەی كـە هـەر كاتێك كارێكی دزێويـان كـرد، يـان سـتەميان لـە خۆيـان كـرد، خوايـان دێتـەوە يـادو داوای لێبـوردن بـۆ گوناحەكانيـان دەكـەن، كێ هەيـە جگـە لـە خـوا لـە گوناحـان ببـوورێ! لـە كاتێكدا كـە دەزانـن سـەرپێچيی فەرمانـی خـوا، چەنـد خـراپ و شـوومەو، لەسـەر ئـەوەی كـە كردوويانـە بـەردەوام نەبـوون.

شايانی باسيشـە كـە ئينسـان بەهـۆی دەوامكردنـی لەسـەر داوای لێبـوردن لـە خـوا كـردن (إستغفار الله)ەوە، ئـەم پێنـج بەرهەمانـەی دەسـتگير دەبـن:

**يەك:** هەر كەسێك بە ڕاستيی داوای لێبوردن لە خوا بكات، خوا لێی خۆش دەبێ، وەك لە چەندان دەقی قورئان و سوننەتدا دەردەكەوێ، بۆ وێنە:

١- نوح -عليه السلام- وەك خوای دادگـەر لێی گێڕاوەتەوە، فەرموويەتی:

﴿ فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا ﴾[2]، واتـە: ئنجـا گوتـم (بـە گەلەكـەم) داوای لێبـوردن لـە پەروەردگارتـان بكـەن، بێگومـان ئـەو زۆر لێبوردەيـە.

٢- {إِنَّ الشَّيْطَانَ قَالَ: وَعِزَّتِكَ يَا رَبِّ لَا أَبْرَحُ أُغْوِي عِبَادَكَ مَا دَامَتْ أَرْوَاحُهُمْ فِي أَجْسَادِهِمْ قَالَ الرَّبُّ وَعِزَّتِي وَجَلَالِي لَا أَزَالُ أَغْفِرُ لَهُمْ مَا اسْتَغْفَرُونِي}[3] ، واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموويەتی: شەيتان گوتوويەتی: ئەی پەروەردگارم! وەچەی ئادەم هەتا گيانەكانيان لە جەستەكانياندا بن، خەريكی گومڕاكردنيان دەبم، [(پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی:] پەروەردگاری زاڵ و پايەداريش فەرمووی: منيش هەتا داوای لێبوردنم لێ بكەن هەر لێيان خۆش دەبم.

---

(١) آل عمران:١٣٥.

(٢) نوح:١٠.

(٣) أخرجه أحمد: ١١٢٥٥، وعبد بن حميد: ٩٣٢، وأبو يعلى: ١٣٩٩، والحاكم: ٧٦٧٢، وقال: صحيح الإسناد.

**دوو:** بە هۆی داوای لێبوردن لە خوا کردنەوە، خوا بەڵاو ئازارو گرفتارییەکان لادەدات، وەك فەرموویەتی: ﴿ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ ﴾[١]، واتە: لە کاتێکدا داوای لێبوردنی لێ بکەن، خوا سزاو ئازاریان نادات.

**سێ:** بەهۆی داوای لێبوردن لە خوا کردنەوە، نازو نیعمەتی ماددیی و مەعنەویی ڕوو لە مرۆڤەکان دەکەن و، تووشی خێرو خۆشیی دەبن:

﴿ وَأَنِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُمَتِّعْكُم مَّتَٰعًا حَسَنًا إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى وَيُؤْتِ كُلَّ ذِى فَضْلٍ فَضْلَهُۥ ۖ وَإِن تَوَلَّوْا۟ فَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ كَبِيرٍ ﴾[٢].

واتـە: کـە داوای لێبـوردن لـە پەروەردگارتـان بکـەن و، پاشـان بگـەڕێنـەوە لای، مسۆگـەر ئـەو هەتـا کاتـی دیارییکـراو، لـە گوزەرانێکـی خۆش بەهرەمەندتـان دەکات و هـەر خاوەن چاکەیـە (پاداشـتە) چاکەکـەی پێدەدات و، ئەگـەر پشـتیش هەڵبکـەن مـن لـە سزای ڕۆژێکـی گـەورە ترسم لەسـەرتان هەیـە.

هەروەها (هـود)یش -علیه السلام- هەمان موژدەی بە گەلەکەی داوە:

﴿ وَيَٰقَوْمِ ٱسْتَغْفِرُوا۟ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوٓا۟ إِلَيْهِ يُرْسِلِ ٱلسَّمَآءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ ﴾[٣]

واتە: ئەی گەلەکەم! داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن و پاشـان بگـەڕێنەوە لای، بێگومـــان بارانـی بـە خوڕزەمتـان بۆ دەنێرێ و، هێـزو پێزی دیکـەش دەخاتـە گـەڵ هێزو پێزتـان.

**چوار:** داوای لێبوردن لە خواکردن، مایەی کار ئاسانیی و دەرووی خێر لێ کردنەوەیە، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ قَالَ

---

(١) الأنفال:٣٣

(٢) هود:٣.

(٣) هود:٥٢.

قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مَنْ لَزِمَ الِاسْتِغْفَارَ، جَعَلَ اللَّهُ لَهُ مِنْ كُلِّ هَمٍّ فَرَجًا، وَمِنْ كُلِّ ضِيقٍ مَخْرَجًا، وَرَزَقَهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ}[1] ، واتە: هەركەسێك لەسەر داوای لێبوردن لە خواكردن بەردەوام بێ، خوا بۆ هەر خەمێك فەڕاحییەك و، بۆ هەر سەغڵەتییەك دەروویەكی بۆ دەرەخسێنێ، بە جۆرێك كە بۆ خۆی چاوەڕوانیی ناكات ڕۆزیی دەداتێ.

پێنج: پاشان داوای لێبوردن لە خوا كردن، دەبێتە مایەی هەمیشەو دایم گەش و ڕوون و پاك و خاوێن مانەوەی دڵ و دەروون و، چڵكن نەبوونی و ژەنگ و ژار نەگرتنی، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّ الْمُؤْمِنَ إِذَا أَذْنَبَ كَانَتْ نُكْتَةٌ سَوْدَاءُ فِي قَلْبِهِ، فَإِنْ تَابَ وَنَزَعَ وَاسْتَغْفَرَ، صُقِلَ قَلْبُهُ، فَإِنْ زَادَ زَادَتْ، فَذَلِكَ الرَّانُ الَّذِي ذَكَرَهُ اللَّهُ فِي ((كِتَابِهِ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَى قُلُوبِهِمْ مَا كَانُوا يَكْسِبُونَ))}[2]، واتە: بڕوادار كە گوناحی كرد، خاڵێكی ڕەش لە دڵیدا پەیدا دەكات، ئنجا ئەگەر گەڕایەوەو دەستی هەڵگرت و داوای لێبوردنی كرد، دڵی سپیی و ساف دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گوناحی زیادكردن، خاڵە ڕەشەكانیش زۆر دەبن، هەتا دەبێتە ئەو ژەنگەی كە خوا لە كتێبەكەیدا باسی كردوە: (نەخێر، بەڵكو كردەوە خراپەكانیان ژەنگی لەسەر دڵیان پەیدا كردوە).

بە كورتیی و بەكوردیی: هەمیشەو دایم پەشێمانیی و گوناح و خراپە لە بیربوون و لەبەر چاوبوون، دەبێتە مایەی بەردەوام داوای لێبوردن (إستغفار) لە خوا كردن، ئەمیش بۆ چاوی تۆبەو گەڕانەوە لای خوا، وەك ئەو برژانگ و پێڵوو و فرمێسكانە وایە، كە چاوی سەر دەپارێزن و، ناهێڵن دووچاری تەم و تانەو لێڵیی ببێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٢٣٤، والحاكم: ٧٦٧٧، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان: ٦٤٥.

(٢) أخرجه ابن ماجه: ٤٢٤٤.

## ٥- سەرگەرم بوون بە کردەوەی چاك و زیکرو پاڕانەوەوە:

ئەمیش هۆکارو فاکتەرێکی دیکەی گرنگی تۆبە بردنە سەرو، پاشەکشە نەکردن و بەرەو گوناح و بانەدانەوەیە بەرەو خراپە.

هەر بۆیەش خوای کاربەجێ لە گەلێك ئایەتاندا، کە باسی تۆبەی کردوە، باسی کردەوەی چاکیشی لەگەڵ کردوە، بۆ وێنە:

- ﴿ وَإِنِّي لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴾[١].

- ﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يَدْخُلُونَ ٱلْجَنَّةَ وَلَا يُظْلَمُونَ شَيْـًٔا ﴾[٢].

- ﴿ فَأَمَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَعَسَىٰٓ أَن يَكُونَ مِنَ ٱلْمُفْلِحِينَ ﴾[٣].

(سید قطب) لە تەفسیری ئایەتی: ﴿ وَمَن تَابَ وَعَمِلَ صَٰلِحًا فَإِنَّهُۥ يَتُوبُ إِلَى ٱللَّهِ مَتَابًا ﴾[٤]دا گوتویەتی: (بێگومان کردەوەی چاك (العمل الصالح) دەیسەلمێنێ کە تۆبەکە ڕاستەو بە هێند گیراوە، لە هەمان کاتیشدا قەرەبووکردنەوەو کەلێن پڕکردنەوەیەکی یەکجار کاریگەریشە بۆ نەفس، کە دەست لە گوناح و سەرپێچیی هەڵبگرێ، چونکە بێگومان سەرپێچییکردن (المعصیة) کردەوەو جم و جۆڵێکە، پێویستە بەکارو جووڵەیەکی دژ، کەلێن و بۆشاییەکەی پڕ بکرێتەوە، ئەگەرنا نەفس بەهۆی ئەو بۆشاییەوە، کە پاش دەست لە گوناح هەڵگرتن هەستی پێ دەکات، دووبارە بە لای گوناحدا دەچێتەوە)[٥].

---

(١) طه:٨٢ .

(٢) مریم:٦٠.

(٣) القصص:٦٧.

(٤) الفرقان:٧١.

(٥) بڕوانە: (في ظلال القرآن) ج٥، ص٢٥٨٠.

ئنجا لـە نێو طاعـەت و کـردەوە چاکەکانـدا زیکـری خـواو پاڕانـەوە (ذکـر اللـه و الدعـاء)[1]، کاریگەرییەکی تایبەتییان هەیە، بۆ ڕاوەستاویی و نەلەخشاویی بابای تۆبەکارو بەرەو خواو چاکە وەرچەرخاو.

جارێ هەرچی زیکرو یادی خوایە، ئەوە خوای بەخشەرو خاوەن کەرەم و لوطف، خۆی ڕایگەیاندوە، کە مایەی ئارامیی و ئۆخژن و تەسکینی دڵانە:

﴿ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَتَطۡمَئِنُّ قُلُوبُهُم بِذِكۡرِ ٱللَّهِۗ أَلَا بِذِكۡرِ ٱللَّهِ تَطۡمَئِنُّ ٱلۡقُلُوبُ ﴾[2].

ئنجا بێگومـان دڵ و دەروونـی بابـای گوناحبـارو سـەرپێچییکار، بەهـۆی گونـاح و خراپـەوە، ڕەش و بـرش و ڕەق و تـەق و نەخـۆش و بێهـۆش بـووەو، پێویسـتە بـە مەڵحەمی زیکرو یادی خوا دووبارە سپیی و ساف و نەرم و گەرم و ساغ و هۆشیار ببێتـەوە، هەروەهـا پاڕانـەوەش ڕۆڵێکی یەکجار گـەورەو گرنگـی هەیـە، لـە توندوتـۆڵ و گـەرم و گـوڕ ڕاگرتنـی، پەیوەندیـی نێـوان بەنـدەو خـوای بـە تەنهـا پەرسـتراو و پەنـا پێ براوو داوالێکارەواو، هۆکارێکی گەورەی زیاتر دابەزینی بەخشش و هیدایەتی خـواو کـەرەم و لوطـف و بەزەیـی بـێ سـنووریەتی، وەك فەرموویەتـی:

﴿ وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ ﴾[3].

واتە: پەروەردگارتان فەرموویەتی: لێم بپاڕێنەوە بە دەنگتانەوە دێم...

لـە فەرمووودەیەکی قودسـییدا فەرموویەتـی: {يَـا عِبَـادِي كُلُّكُـمْ ضَـالٌّ إِلَّا مَـنْ هَدَيْتُـهُ فَاسْـتَهْدُونِي أَهْدِكُـمْ}[4]، واتـە: ئـەی بەندەکانـم! هەمووتـان سـەرگەردانن، مەگـەر ئـەو کەسـەی مـن هیدایەتـم دابـێ، دەجـا داوای هیدایەتـم لـێ بکـەن، ڕێڕوونییتـان دەکـەم.

---

(١) لە كتێبی چوارەمی مەوسووعەی: (خواپەرستیی ئیسلامیی)دا، دروشمی پێنجەم: (زیکری خوا)، بە درێژیی باسی ئەم بابەتەمان کردوە، بڕوانە: چاپی دووەم/ نووسینگەی تەفسیر.

(٢) الرعد:٢٨.

(٣) غافر:٦٠.

(٤) أخرجه مسلم: ٢٥٧٧، وابن حبان:٦١٩.

## ٦- گەشبینیی و ئومێد و هیوای پتەو بە ڕەحمەت و بەخشندەیی خوا بوون:

خواناسـان گوتوویانـە: شـەیتان بـۆ یەکێـك لـە دوو شـتان لـە مرۆڤدا هـەوڵ دەدات، هەرکامێکیانـی چەنـگ بکـەوێ ڕازییـە:

أ- لە خۆبایی بوون (الغرُور) لەکاتی سەرکەوتن و هەبووندا.

ب- بێهیوابوون (اليأس) لەکاتی کەوتن و نەبووندا.

ئنجا یەکی دیکە لـە هـۆکارە گرنگەکانـی سـەرگرتنی تۆبـەی بابـای بـەرەو خوا گـەڕاوە، ئەوەیـە کـە وریـا بـێ و بەهـۆی هێنانـە پێش چاوی گونـاح و خراپەکانیـەوە، گیـرۆدەی دەردی کوشـندەی نـا ئومێدیـی و دەسـت لـە خۆشـۆردن نەبـێ و، یەکێـك لـە دوو ئامانجـە گرنگەکانـی شـەیتان نەهێنێتـە دی.

دیـارە هانـدانی ئینسـانیش بـۆ گەشـبینیی و، ئومێـدو هیـوای زۆر بـە ڕەحمـەت و بەخششـی خـوا بـوون، لـە قورئـان و سـوننەتدا، زۆر دێتـە بەرچـاو، بـۆ وێنـە:

١- ﴿ قُلۡ يَٰعِبَادِيَ ٱلَّذِينَ أَسۡرَفُواْ عَلَىٰٓ أَنفُسِهِمۡ لَا تَقۡنَطُواْ مِن رَّحۡمَةِ ٱللَّهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ جَمِيعًاۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلۡغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ ﴾[1].

واتـە: (ئـەی موحەممــەد!) بـەو بەندانـەم بڵـێ کـە بەرانبـەر بـە خۆیـان زیادەڕۆییـان کـردوە! لـە بەزەیـی خـوا نائومێـد مەبـن، بێگومـان خـوا لـە تێکـڕای گوناحەکان دەبـوورێ، مسـۆگەر هـەر ئـەوە لێبـوردەی بـە بەزەیـی.

٢- {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: يَقُولُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ أَنَا عِنْدَ ظَنِّ عَبْدِي بِي، وَأَنَا مَعَهُ حِينَ يَذْكُرُنِي، إِنْ ذَكَرَنِي فِي نَفْسِهِ ذَكَرْتُهُ فِي نَفْسِي وَإِنْ ذَكَرَنِي فِي مَلَإٍ ذَكَرْتُهُ فِي مَلَإٍ هُمْ خَيْرٌ مِنْهُمْ، وَإِنْ تَقَرَّبَ مِنِّي شِبْرًا تَقَرَّبْتُ إِلَيْهِ ذِرَاعًا، وَإِنْ تَقَرَّبَ إِلَيَّ ذِرَاعًا تَقَرَّبْتُ

---

(١) الزمر:٥٣.

مِنْهُ بَاعًا، وَإِنْ أَتَانِي يَمْشِي، أَتَيْتُهُ هَرْوَلَةً}[١]، واتە: خوای باڵادەست و پایەبەرز دەفەرموێ: من بە گوێرەی بۆچوونی بەندەکەمم بەرانبەرم و، من لەگەڵی دام کاتێك یادم دەکات، ئنجا ئەگەر لە دڵی خۆیداو لەبەر خۆیەوە یادم بکات، منیش لە لای خۆمەوە یادی دەکەم و، ئەگەر لە نێو کۆمەڵێکدا یادم بکات، منیش لەنێو کۆمەڵێکی لەوان چاکتردا یادی دەکەم، ئەگەر بستێك لێم نزیك بێتەوە، باسکێك لێی نزیك دەبمەوە، ئەگەر باسکێك لێم نزیك بێتەوە، من باڵێك لێی نزیك دەکەومەوە، ئەگەر بەڕۆیشتن بۆ لام بێ، بە ڕاکردن دەچمە لای.

(النَّووي) لە ڕاڤەی ئەم فەرمایشتە بەرزو پیرۆزەدا گوتوویەتی: (ومعنى أنا عند ظن عبدي بي: أي بالغفران له إذا استغفر، والقبول إذا تاب، والإجابة إذا دعى، والكفاية إذا طَلَب، وقيل: المراد به الرَّجاءُ وتأميلُ العفو وهذا أصح)[٢]، واتە: مانای: من بە گوێرەی بۆچوونی بەندەکەمم بەرانبەرم، یانی: بە لێبوردن ئەگەر داوای لێبوردنی کردو، وەبەوەرگرتن، ئەگەر گەڕایەوە، بە دەنگەوەچوون، ئەگەر پاڕایەوە، بەمشوور لێ خواردن، ئەگەر داوای کرد، گوتراوە: مەبەست پێی ئومێدو هیوای لێبوردن خستنە بەرچاوە، ئەمەش ڕاستترە.



---

(١) أخرجه مسلم: ٢٦٧٥.

(٢) (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١٧، ص٢.

**٧- نەبەزین و کول نەبوون و کۆڵنەدان، بەهۆی دووبارە لادان و خلیسکانەوە:**

ئەمیش هۆکارو فاکتەرێکی دیکەی گەورەی سەروبەرگرتنی تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای بە بەزەییەو، زادەو بەرهەمی هۆکاری پێشەوەشیەتی.

خوای بەخشندەو پێغەمبەرەکەیشی (صلی الله علیه وسلم) لە چەندان دەقی قورئان و سوننەتدا، مرۆڤیان هانداوەو هەڵناوە بۆ نەبەزین و پاشەکشەنەکردن و چەك فڕێنەدان و سەنگەر چۆڵ نەکردن، لە بەرانبەر شەیتان و پیلان و فیڵ و تەڵەو داوەکانیداو، ڕایانگەیاندوە کە هەمیشەو دایم دەرگای تۆبە لێ وەرگیران و بەخشران، ئاوەڵاو لەسەر پشتەو، ئینسان هەرچەندە زۆر گوناحبارو نالەبار بێ و یەکجاری خۆی پیس و چڵکن و لێخن کردبێ، دیسان ڕەحمەت و بەزەیی و لێبوردن و بەخشش و کەرەمی خوا، گەورەترو فراوانترە! با سەرنجی ئەم چەند دەقە بدەین:

١- ﴿ وَرَحۡمَتِي وَسِعَتۡ كُلَّ شَيۡءٖ ﴾[1]، واتە: بەزەیی من هەموو شتێکی گرتۆتەوە.

کەواتە: بەزەیی و لێبوردن و بەخشینی خوا، لە هەموو کەس و هەموو دروست کراوێك گەورەترو فراوانترە، بەو پێیە، ڕوو لە هەر گوناحێك بکات، هەرچەندە زۆر زل و ناقۆلاش بێ، دایدەپۆشێ.

٢- ﴿ وَهَلۡ نُجَٰزِيٓ إِلَّا ٱلۡكَفُورَ ﴾[2]، واتە: ئایا جگە لە سپڵەو ناسوپاس، سزای هیچ کەس دیکە دەدەین؟!

کەواتە: ئینسان مەگەر سپڵەو پێ نەزان و بێ ئەمەگ بێ، ئەگەرنا خوا دەیبەخشێ و دەیخاتە ژێر سایەی بەزەیی و بەخشندەیی خۆیەوە.

---

(١) الأعراف:١٥٦.

(٢) سبأ:١٧.

٣- (لما خلق الله الخلق، كتب في كتاب فهو عنده فوق العرش: إن رحمتي سبقت غضبي)[١]، واتە: كاتێك خوا دروستكراوەكانی خوڵقاندن، لە نووسراوێك كە لەسەر بارەگا لە لایەتی نووسی: بێگومان بەزەییەكەم پێش تووڕەییەكەم كەوتۆتەوە.

٤- {وَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَوْ لَمْ تُذْنِبُوا، لَذَهَبَ اللَّهُ بِكُمْ، وَلَجَاءَ بِقَوْمٍ يُذْنِبُونَ فَيَسْتَغْفِرُونَ اللَّهَ، فَيَغْفِرُ لَهُمْ}[٢]، واتە: سوێند بەو كەسەی گیانی منی بە دەستە، ئەگەر هاتباو گوناحتان نەكردبایە، خوا ئێوەی لادەبردو كۆمەڵێكی دەهێنان گوناح بكەن و، داوای لێبوردن بكەن و، ئەویش لێیان ببوورێ!

كەواتە: با هیچ كەس بە هۆی خلیسكان و هەڵەنگووتنی چەند بارەوە، بێ هیوا نەبێ و نەبەزێ و كول نەبێ و كۆڵ نەدات و، دڵنیاو مسۆگەریش بێ كە مادام لەسەر جادەی شەرع بێ و، ڕێسمانی بەندایەتیی بۆ خوا كردن و تۆبەو داوای لێبوردن لێكردنی، هەر لە گەردندا بێ، خوای بێ سنوور بە بەزەیی و بەخشندەو میهرەبان، هەر بە چاوی ڕەحمەتی خۆی تەماشای دەكات!

با كۆتایی ئەم تەوەری دووەمەش، بەم فەرمایشتە بەرزو دڵخۆشكەرەی خوای پەروەردگار بێنین، كە پێغەمبەری دڵنەرم و میهرەبانی لێی دەگێڕێتەوە:

{عَنْ أَنَس بْنُ مَالِكٍ قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ يَقُولُ قَالَ اللَّهُ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَا ابْنَ آدَمَ! إِنَّكَ مَا دَعَوْتَنِي وَرَجَوْتَنِي، غَفَرْتُ لَكَ عَلَى مَا كَانَ فِيكَ وَلَا أُبَالِي، يَا ابْنَ آدَمَ! لَوْ بَلَغَتْ ذُنُوبُكَ عَنَانَ السَّمَاءِ، ثُمَّ اسْتَغْفَرْتَنِي غَفَرْتُ لَكَ وَلَا أُبَالِي، يَا ابْنَ آدَمَ! إِنَّكَ لَوْ أَتَيْتَنِي بِقُرَابِ الْأَرْضِ خَطَايَا، ثُمَّ لَقِيتَنِي لَا تُشْرِكُ بِي شَيْئًا لَأَتَيْتُكَ بِقُرَابِهَا مَغْفِرَةً}[٣]، واتە: خوای بەرز فەرموویەتی: ئەی ئادەمزاد! بێگومان هەتا تۆ لێم وەپاڕێی و ئومێدەوارم بی، هەر لێت دەبوورم، هەرچییەكت كردبێ

---

(١) أخرجه البخاري: ٦٩٦٩، ومسلم: ٢٧٥١.

(٢) أخرجه أحمد: ٨٠٦٨، ومسلم: ٢٧٤٩.

(٣) أخرجه الترمذي ٣٥٤٠، وقال: حديث حسن.

بەلامەوە گرنگ نیە! ئەی ئادەمزاد! ئەگەر گوناحەکانت بگەنە چەشمەندازی ئاسمانیّ، پاشان داوای لێبوردنم لێ بکەی، لێت خۆش دەبم! ئەی ئادەمزاد! مسۆگەربە ئەگەر تۆ پڕاوپڕی زەمین گوناحانم بۆ لەگەڵ خۆت بهێنی، بە مەرجێك کە دەمگەیە هاوبەشم بۆ دانەنێی، منیش لێواو لێوی زەمین لێبوردنت بۆ دێنم!

پێشم وایە موژدە لەمە گەورەترو دڵخۆشکەرتر، بۆ بابای تۆبەکاری لەسەر داوای لێبوردن کردن بەردەوام، نیەو نابیّ.

بێگومان مەبەستیش لەم دەقانە، ڕێگرتن و پێشگیریی کردنە لە بەزین و تێکشکان و نائومێد بوون و، خۆ لە بەرچاو کەوتن و خۆ لەبەرچاو بێزاران، بەهۆی گوناح و هەڵەو کەم و کووڕییەکانەوە، نەك ڕیّ بۆ گوناح کردنەوەو بێباك کردن، لە تۆڵەو سزای خوا! گوتراویشە: (لكل مقام مقال).

کەسێکیش شارەزای عەقیدەی شێوێنراوی نەصرانییەکان بیّ، لەوبارەوە کە هەموو ئینسانەکان، هەر بە زگماك بە گوناحبار دەزانن! پاشان بشزانیّ کە ئەو جۆرە بیروبۆچوونە بەناو ئایینیە ئەفسانەو داهێنراوە، خەڵکی ئەوروپاو ڕۆژئاوای تووشی چەندان جۆرە گریّ و نەخۆشیی دەروونیی (عقد وأمراض نفسية) کردوە، وەك (فرۆید)و دەروونناسەکانی دیکە، بە هەڵە یان بە ڕاست ئاماژەیان پێکردوە، زیاترو چاکتر حیکمەتی ئەم دەقە شەرعییانەی بۆ ئاشکرا دەبیّ.




# تۆبە لەچی و چی دەکرێ؟!

١- ناوە گشتییەکانی گوناح و سەرپێچییەکان.

٢- گوناحەکان یەکسان نین، بەڵام تۆبە لە هەموویان پێویستە.

٣- ئەو هۆیانەی گوناحە گچکەکان لە حوکمدا، دەگۆڕن بۆ هی گەورە.

**خوێنەری بەڕێـــز!**

دوای ئەوەی لە بەشەکانی پێشوودا زانیمان، تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا:

١- چییەو؟

٢- چۆنەو؟

٣- حوکمی چییەو؟

٤- مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ چین و، ئەو هۆکارانە چین کە ئینسان بەهۆیانەوە دەتوانێ ڕاوەستاو و نەلەخشاوبێ و، دووچاری پاشاکشەو شکست نەبێ، لە بەرانبەر شەیتان و فێڵ و پیلانەکانی و نەفس و ئارەزوو و خواستە نا شـەرعییەکانیدا؟

کاتی ئەوە هاتوە کە لەم بەشی پێنجەمەشدا، تیشك بخەینە سەر خودی ئەو شتانەی کە بە گوناح و خراپەو تاوان دادەنرێن و، تۆبە لێکردنیان پێویستە، کە ئێمە خوا یار بێ لە سێ تەوەردا، باسی ئەو گوناحانە دەکەین کە تۆبەیان لێ دەکرێ، بەم شێوەیەی خوارێ:

## تەوەری یەکەم:
## ناوە گشتییەکانی گوناح و سەرپێچییەکان[١]

گوناح و سەرپێچییەکان، وێڕای ئەوەی کە هەرکامێکیان ناوی تایبەتی خۆی هەیە، کە بێگومان سەرژمێرکردنیان زۆر زەحمەتە، بە هەمووشیان چەند ناوونیشانێکی گشتییان هەیە، کە هەرکام لەو ناوونیشانانە، هەموویان، یان زۆربەیان دەگرنەوە.

بەندەش پاش سەرنجدان و تێوەڕامانی قورئان، ئەم حەڤدە (١٧)ناوە گشتییەم کەوتنە بەرچاو، کە ئەوە لە خوارەوە ڕیزیان دەکەم:

١- إثـم: کە لە زمانی کوردییدا هەر بە (گوناح) مانای دەکرێ و (راغب الأصفهاني)یش گوتوویەتی: لە ئەسڵدا لە (المبطيء عن الثواب) واتە: دواخەر لە پاداشت، هاتوە[٢].

٢- بغـي: کە لە کوردییدا (یاخیی بوون)ی بۆ بەکاردێ و (راغب)یش بە: (طلب تجاوز الإقتصاد) خواستنی دەرچوون لە میانەڕەویی، پێناسەی کردوە[٣].

٣- جُناح: کە لە کوردییدا هەر بە (گوناح) یان (تاوان) مانا کراوە و وەك (راغب)یش دەڵێ: لە ئەسڵدا بریتییە لە (الميل إلى الإثم) لادان بەرەو گوناح[٤].

---

(١) دیارە مەبەستمان لە مانای گوناح و سەرپێچیی، مانا عورفی و فیقهییەکەیەتی، بۆیە تەنیا باسی ئەو گوناحانە دەکەین کە لە خوار (کُفر و شرك و نفاق)ەوەن.

(٢) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص(٦٣ ـ ٣٤).

(٣) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ، ص ١٣٦.

(٤) هەمان سەرچاوە، ص ٢٦١.

٤- حُـوُبْ: لـە كوردييـدا هـەر (گونـاح)ەو (راغب)يـش هـەرواى مانـا كـردوە، بـەڵام گوتوويەتـى: لـە ئەسـەڵدا لـە (زَجـر الإبِـل)ەوە هاتـوە، كەواتـە (حُـوُبْ) هـەر گوناحێكـە كـە تێوەخوڕيـن (زجـر)و دەنگدانـى لـە بەرانبـەر بـێ [1].

٥- خَطَـأْ خِطْـأ، خطيئـة: كـە لـە كوردييـدا (هەڵـە)و (تـاوان) يـان لـە بەرانبـەردا دانـراوەو (راغب)يـش گوتوويەتـى: لـە ئەسـڵدا بريتيـن لـە: (العـدولُ عـن الجهـة) لادان لـە لاى مەبەسـت [2].

٦- ذنـب: كـە لـە كوردييـدا هـەر (گونـاح)و (تـاوان)ى لـە بەرانبـەردا دانـراوەو (راغب)يـش گوتوويەتـى: لـە ئەسـڵدا لـە (ذَنَـبْ) كـە بـە مانـاى (كلك)ە، هاتـوەو بـە هـەر كردەوەيـەك دەگوتـرێ، كـە ئـاكام و ئەنجامەكـەى خـراپ بـێ: (يسـتعمل في كل فعـل يسـتوخم عُقبـاه، اعتبـاراً لمـا يحصـلُ مـن عاقبتـه)[3].

٧- زيـغ: كـە لـە كوردييـدا (لادان)ەو، (راغب)يـش بـە (الميـلُ عـن الإسـتقامة) لادان لەڕێـك وەسـتاويى، مانـاى كـردوە[4].

٨- جريمـــة: كـە لـە كوردييـدا زياتـر (تـاوان)ى بـۆ دانـراوەو، لـە ئەسـڵى زمانـى عەرەبييشـدا، وەك (راغـب) گوتوويەتـى: لـە (جُـرْم)ەوە هاتـوە، كـە بـە مانـاى بڕيـن (قَطْـع)ە، دەگوتـرێ: (جَـرَمَ الثمـرة مـن الشـجرة) ميوەكـەى لـە درەختەكـە بـڕى[5].

٩- سيئة: كـە لـە كوردييـدا مانـاى (خراپـە)يـەو، (راغب)يـش بـە (الفعلة القبيحة) كـردەوەى دزێـو، مانـاى كردوە[6].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٢٦١.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٢٨٧ ـ ٢٨٨.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٣٣١.

(٤) هەمان سەرچاوە، ص ٣٨٧

(٥) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ، ص١٩٢.

(٦) هەمان سەرچاوە، ص (٤٤١-٤٤٢).

١٠- عصيـان: كـە لـە كورديـيدا (سـەرپێچيى) دەگـەيەنـێ و، لـە ئەسـڵی زمانـی عەرەبييشـدا وەك (راغـب) گوتوويەتـی: (عـصى: خـرج عـن الطاعـة) لـە (التّمنُّـع بالعـصى)ەوە هاتـوە[١]، واتـە لاملیـی و سـەرپێچيی کـردن بـە هـۆی گـۆچانـەوە، کـە مەبەسـت زۆرو دەسـتەڵاتە.

١١- عُتُوّ: كە ڕەنگە لە زمانی کوردییدا (مل نەدان) يان (ياخيی بوون) بگەيەنێ، (راغب) دەڵێ: بريتيە لە (النبوُّ عن الطاعة) دورەپەرێزيی لە فەرمانبەريی[٢].

١٢- طُغيـان: كـە لـە کورديـيدا (سـنوور شـکاندن)و (سـەرکێشـيی) دەگـەيەنـێ، (راغب)يـش بـە (مجـاوزة الحـدّ في العصيـان) سـنوور بەزانـدن لـە سـەرپێچييدا، مانای کـردوە[٣].

١٣- فجـور: كـە لـە کورديـيدا (بێناموسيی) يـان (بێ حەيايی) لـە بەرانبـەردا، لـە ئەسـڵی زمانـی عەرەبييشـدا، بـە مانـای دڕيـن و لەتکـردن (شَـقّ)ە، (راغـب) گوتوويەتـی: (الفجـر: الشـق والفجـور: شـق سـتر الديانـة) واتـە: دڕينـی پـەردەی دينداريیـە[٤].

١٤- فسـوق: كـە لـە کورديـيدا (لـە ڕێ دەرچـوون)و (لاڕێ بـوون) دەگـەيەنـێ و، لـە ئەسـڵی زمانـی عەرەبييشـدا، لـە (فسـق الرُّطَـبُ عـن قشرتـه، أي: خـرج) {خورمـا لـە کيفەکـەی هاتـە دەرێ} وە، هاتـوە، کـە مەبەسـت ئـەو تووڕەکـەو کيفەيـە هێشـووەکەی تێدايـە، بـەر لـەوەی گـەورەبێ و پـێ بـگات، (راغب)يـش لـە پێناسـەی وشـەی (فِسـق) دا گوتوويەتـی: (فسـق: خـرج عـن حِجْـر الـشرع)، واتـە: (فسـق) يانـی: لـە بازنـەو جوغـزی شـەرع چـووە دەرێ[٥].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٥٧٠.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٥٤٦.

(٣) هەمان سەرچاوە، ص ٥٢٠.

(٤) هەمان سەرچاوە، ص ٦٢٦.

(٥) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ، ص ٦٣٦.

١٥- فسـاد: کـە لـە کوردییـدا (خراپەکاریـی)و (تێکچوون)و (ئاشـووب) دەگـەیەنێ و (راغب)یـش بـە: (خـروج الـشّيء عـن الإعتـدال) دەرچوونـی شـت لـە حاڵەتـی ئاسـایی خـۆی، مانـای کـردوە[1].

١٦- لَمَـم: کـە لـە کوردییـدا (لـێ نزیـك بوونـەوە)و (لە دەورە هەڵاتـن) دەگـەیەنێ، (راغب)یـش دەربـارەی ئەسـڵی واتایەکـەی لـە عەرەبییـدا، گوتوویەتـی: (أَلْمَمْـتُ بکـذا: قارَبْتُـه، وفـلان يفعـل كـذا لَمَـماً، أي حينـاً بعـد حـين، وفـلان زيارتـه إلمـام أي قليـل، واللَّمَـمُ: الصغـيرة)[2]، واتـە: (ألممـت بكـذا:) لێـی نزیـك كەوتمـەوە.

(فـلان يفعـل كـذا لَمَـماً): فڵانکـەس جاروبـار ئـەو شـتە دەکات. (فـلان زيارتـه إلمـام:) فڵانکـەس کـەم کـەم سـەردان دەکات. (لَمَـم:) گوناحـی گچکـە.

کەواتـە: ئێسـتا دەزانیـن بۆچـی زانایـان وشـەی ((اللَّمم)یـان کـە لـە ئایەتـی ژمـارە (٣٢) سـوڕەتی (النجـم)دا هاتـوە، بـە گوناحـی گچکـە (صغـيرة) تەفسـیر کـردوە.

١٧- وِزر: کـە لـە کوردییـدا هـەر وشـەی (گونـاح)و (تـاوان)ی لـە بەرانبەردایـەو (راغب)یـش گوتوویەتـی: لـە ئەسـڵدا بـە مانـای قورسـیی (ثِقَـل) دێ و، پاشـان کـراوە بەنـاو بـۆ گوناحـەکان، چونکـە بـاری شـانی خاوەنیـان گـران دەکـەن[3].

---

(١) هەمان سەرچاوە، ص ٦٣٦.

(٢) هەمان سەرچاوە، ص ٧٤٦.

(٣) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص ٨٦٧.

## تەوەری دووەم:

## گوناحەکان یەکسان نین، بەڵام تۆبەکردن لە هەموویان فـەڕزە

گوناح و سەرپێچیی، کە بەگشتیی دەتوانین بڵێین: بریتیە لە (ئەنجامدانی هەر جموجۆڵێکی عەقڵیی و دەروونیی و زمانیی و جەستەیی کە خوا قەدەغەی کردوە، چواندنی هەر جموجوڵ و کردەوەیەکی پەنهان و ئاشکرا، کە خوا پێویستی کردوە)، جۆراوجۆرە و بەگشتیی بۆ دوو جۆر:

أ- گەورە (کبیرة).

ب- گچکە (صغيرة)، دابەش دەبێ، کە دوایی پێناسەیان دەکەین.

بەڵام ئەوەی زانایان لەسەری رێککەوتوون و، بەر لەوەش دەقەکانی قورئان و سوننەت دەیگەیەنن، ئەوەیە کە تۆبەکردن لە هەموو جۆرەکانی گوناح لەسەر ئینسان فەڕزە[1]، بە هەموو جۆرەکانی گوناح هەرناوێکیان هەبێ و، لە هەر ئاستێکدا بن، ئینسان کەم و زۆر، دووچاری گوناحباریی و گلەیی و سەرزەنشت و سزاو جەزرەبەی خوای دادگەر دەبێ.

کەواتە: تۆبەو گەڕانەوەی ڕاست و ساغ بۆ لای خوا، ئەوەیە کە بابای تۆبەکار لە هەرچی گوناح و خراپەی ئاشکراو پەنهان و، وردو[2] درشت و،

---

(١) بەڵام سوننەت و پەسەند وایە لە هەر شتێکی ناپەسەندو لە هەر بێ ئاگایی (غفلة) یەکیش هەر تۆبە بکات، با پێشیان گوناحبار نەبێ، بڕوانە: (الآداب الشرعية) لابن المفلح، ج١، ص١٦٤.

(٢) (الآلوسي) گوتوویەتی: (التوبة من الصغائر واجبة على مانقل الأشعري، وحكى إمام الحرمين الإجماع عليه) بڕوانە: (روح المعاني). ١٢، ص٥٩، واتە: تۆبە لە گوناحە گچکەکان فەڕزە، وەك (أشعري) نەقڵی کردوەو (إمام الحرمين)یش یەکدەنگیی زانایانی

کۆن و تـازەو، زانـراو نەزانـراوی هەیـە، پەشێمان بـێ و دەسـتیان لـێ هەڵگرێ و نەگەڕێتـەوە سـەریان و..هتـد.

ئنجا با بێینەوە سەر جۆرەکانی گوناحەکان:

هەندێـك[1] لـە زانایـان ڕایـان وایـە، کـە گونـاح و سـەرپێچییەکان هەموویـان لەیـەك ئاسـتدان و، سـەرجەمیان بـە گـەورە (کبـيرة) دادەنرێـن! بـەڵام لـە ڕاسـتییدا وا نیـەو، ڕای زۆربـەو جەمـاوەری زانایـان ڕاسـتە، کـە گوتوویانـە: گوناحـەکان لـە یـەك ئاسـتدا نیـن و گـەورەو گچکەیـان هەیـە[2].

ئەمەش چەند بەڵگەیەك لەوبارەوە:

١- ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾[3].

واتـە: ئەگـەر خۆتـان لـەو گوناحـە گەورانـە بپارێـزن کـە لێتـان قەدەغەکـراون، خراپەکانتـان لـێ دەسڕینەوەو، دەتانخەینـە جێگایەکـی پـڕ ڕێـزو حورمەتـەوە.

(القرطبـي) لـە تەفسیری ئـەم ئایەتـەدا نووسیویەتی: (لما نهـى الله تعالـى فـي هـذه السـورة عـن آثـام هـي كبائـر، وَعَـدَ علـى اجتنابهـا التخفيـف مـن الصغائـر، ودلَّ هـذا علـى أن فـي الذنـوب كبائـر وصغائـر، وعلـى هـذا جماعـة أهـل التأويـل وجماعـة الفقهـاء) [4]، واتـە: لەبـەر ئـەوەی خـوای بـەرز لـەم سـوورەتەدا چەنـد گوناحێکـی قەدەغەکـردوون، کـە گوناحـە زلەکانـن، بەڵێنـی داوە لەسـەر دووره پەرێزیـی لێیـان،

---

لەسەر نەقڵ کردوە.

(١) بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج١ ص٨، إبن حجر الهيثمي.

(٢) بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو هەمان بەرگ و لاپەڕە، و: (التوبة في ضوء القرآن الكريم)، ص ٨٩.

(٣) النساء:٣١.

(٤) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) ج٥، ص ١٥٨.

کە گوناحە گچکەکان لابەرێ، ئنجا ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە گوناحەکان گەورەو گچەکەیان تێدان، ئەمەش ڕای کۆمەڵی توێژەرەوانی قورئان و سەرجەم شەرعزانانیشە.

٢- ﴿ ٱلَّذِينَ يَجۡتَنِبُونَ كَبَٰٓئِرَ ٱلۡإِثۡمِ وَٱلۡفَوَٰحِشَ إِلَّا ٱللَّمَمَۚ ﴾[١].

واتە: ئەو کەسانەی کە خۆیان لە گوناحە زلەکان و ناقۆڵایەکان دەپارێزن، جگە لە وردە گوناحەکان (لێیان دەبوورین).

واتە: وردە گوناحەکان ئەگەر خۆشیانیان لێ نەپارێزن، مادام دوورە پەرێز بووبن لە گوناحەزلەکان، ئەوە هەر لێیان خۆش دەبین.

٣- {عَن أَبِي هُرَيْرَةَ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: الصَّلَوات الْخَمْسُ وَالْجُمْعَةُ إِلَى الْجُمْعَةِ، ورمضان إلى رمضان، كَفَّارَةٌ لِمَا بَيْنَهُنَّ، مَا لَمْ تُغْشَ الْكَبَائِرُ}[٢]، واتە: پێنج نوێژە (فەرزە)کان و، جومعە بۆ جومعەو، ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان، (گوناحەکانی) نێوان خۆیان دەسڕنەوە، بە مەرجێك دوورە پەرێزیی لە گوناحە زلەکان کرابێ.

کەواتە: (أبو حامد الغزالي) گوتەنی: (إنكار الفرق بين الكبائر والصغائر لا يليق وقد عُرِفا من مدارك الشرع)[٣]، واتە: نکوولّیی کردن لەوە کە گوناحەزلەکان و گچکەکان جیاواز نین، قسەیەکی شیاو نیە، چونکە بە تەئکید لە بەڵگەو سەرچاوە شەرعییەکان فامراونەوە، ئنجا با سەرنج بدەین داخۆ پێناسەی هەرکام لە گوناحی گەورەو گچکە چۆنە؟!

---

(١) النجم:٣٢.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٣٣.

(٣) بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج١، ص٩.

## گوناحی زل (الكبيـرة):

زانایان لەبارەی ناساندنی گوناحە گەورەکانەوە، بوونە دوو کۆمەڵ:

أ- هەندێکیان بە دانانی پێناسەی (تعريف) دەیناسێنن، واتە: (بالحدّ).

ب- هەندێکیشیان بە سەرژمێرکردنی گوناحەزلەکان دەیانناسێنن، واتە: (بالعدّ).

ئنجا لـە پێناسـەکان، باشـترینیان وەك (ابــن حجـر العسـقلاني) و[1] (ابـن حجـر الهيتمـي)[2] گوتوویانـە: پێناسـەکەی (القرطبــي)یە کـە لـە کتێبـی (المفهـم شرح صحيـح مسـلم)دا هێناویەتـی و[3] ئاوایـە: (كل ذنـب أطلـق عليـه بنـص كتـاب أو سُـنّةٍ أو إجـماع، أنـه كبـيرة أو عظيـم، أو أخـبر فيـه بشـدة عقـابٍ، أو عُلِّـق عليـه الحَـدّ، أو شُـدِّد النكـير عليـه، فهـو كبـيرة)، واتـە: {هـەر گوناحێـك کـە بـە دەقـی قورئـان، یـان سوننەت، یـان ئیجمـاع، نـاوی (گـەورە) یـان (مـەزن)ی لـێنرابێ، یـان لـە بارەیـەوە سزای تونـد ڕاگەیەنرابێ، یـان سزاو تۆڵـە (حَـدّ)ی شـەرعیی بـۆ دیاریـی کرابێ، یـان زۆر نارەزایـی لـە بـارەوە پێشـان درابێ، ئـەوە گوناحـی زلـە}.

بـۆ سـەرژمێر (إحصاء)یـش پێموایـە هیـچ کـەس وەك (ابـن حجـر الهيتمـي) سـەرژمێری نەکـردوون کـە لـە کتێبـی (الزواجـر عـن اقـتراف الكبائـر)دا، چوارسـەدو شەسـت و حـەوت (٤٦٧) گوناحـی بەنـاوی گوناحەزلەکانـەوە ڕیـز کـردوون[4]،

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج١٢، ص ١٨٢.

(٢) بڕوانـە: (الزواجـر عـن إقتـراف الكبائـر) ج١، ص ٩ تـا ١٣، بـەڵام (الهيتمـي) لـە (قرطبـي) يـەوە نەقڵـی کـردوەو شـێوەی پێناسـەکەی (قرطبـي) لـە (ابـن الصـلاح الشـهرزوري) يەوە ئەمیـش لـە (الجلال البلقيني)يەوە هێناویەتـی و پەسـەندیشی کـرد، هەروەهـا (الهيتمـي) لـە (شـيخ الاسـلام البارزي)یشـەوە هێناویەتـی.

(٣) وەك (ابن الحجر العسقلاني) لێیەوە نەقڵی کردوە، بڕوانە: (فتح الباري) ج١٢، ١٨٢.

(٤) بڕوانـە: هـەردووك بەرگـی (الزواجـر..) لەسـەرەتای بەرگـی يەكەمـەوە هەتـا لاپـەڕە (٩٥٣) لـە بەرگـی دووەمـدا.

هەرچەندە بێگومـان هەندێکیـان بۆ وێنە: ڕوانینی[١] حەرام (النظرُ الحرام) گەورە نیـن و گچکـەن، بـەڵام بەهەرحـاڵ پێموایـە گوناحـی گـەورەی نەبـواردوە.

## گوناحی گچکـە (الصغيرة):

دەربارەی پێناسـەی گوناحـی گچکـە (الصغيرة)یـش زانایـان ڕاجیاییەکـی کەمیـان هەیـە، بـەڵام چاکتریـن و ڕاسـتترین پێناسـە، بۆ گوناحـی گچکـە ئەمەیـە[٢].

(الصغـيرة: هـي كل ذنـب لم يختـم بِلَعْنـةٍ أو غضـبٍ أو نـارٍ)، واتـە: گوناحـی گچکـە: هـەر گوناحێکـە کـە لەعنـەت، یـان تووڕەیـی خـوا، یـان ئاگـری دۆزەخـی لەسـەر بـاس نەکرابـێ.

شـایانی باسـە کـە (ابـن تيميـة)ش ئـەم پێناسـەیەی هەڵبـژاردوە، ئـەم بەڵگانەشـی لەسـەر هێناونەوە[٣]:

**یەك:** ئەم پێناسەیە لە زانایانی پێشین، وەك (ابن عباس) رضي الله عنهما و (أحمد بن حنبل)و غەیری ئەوانیشەوە هاتوە.

**دوو:** خوای بەخشەر فەرموویەتی: ﴿إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا﴾[٤]،

وەك دەبینیـن خـوای فەرمایشـت ڕاسـت و دادگـەر، گفتـی داوە بـە هـەر کەسـێك کـە خـۆی لـە گوناحەزلـەکان بپارێـزێ، وردە گونـاح و هەڵەکانـی لـێ بسـڕێتەوە، دەجـا بێگومـان کەسـانێك ئـەو گونـاح و تاوانانـە بکـەن، کـە خـوا بـە نەفریـن و

---

(١) بڕوانە: (الزواجر..)ج٢، ص (٥٣٣ تا ٥٣٦)، (الكبيرة) ٢٤٢)، بەڵام خۆیشـی ڕاجیـایی تێـدا باس کردوە.

(٢) بڕوانە: (شرح العقيدة الطحاوية) لابن أبي العِزّ الحنفي، ص٣٧١.

(٣) بڕوانە: (الفتاوى الكبرى) لابن تيمية ج٤، ص٢٩٧.

(٤) النساء :٣١

تووڕەیی و خەشمی خۆی و ئاگر، مۆری کردوون، یان سزاو تۆڵەی دنیایی بۆ دیاری کردوون، ناگونجێ بڵێین: کە ئەو جۆرە کەسانە گفت و بەڵێنی خوایان بۆ هاتۆتە دی، کەواتە: دەبێ گوناحە گچکەکان غەیری ئەو جۆرە گوناح و تاوانانە بن.

**سێ:** ئەو پێناسەیە دەگەڕێتەوە بۆ ئایەتەکانی قورئان و فەرمایشتەکانی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم).

**چوار:** بە گوێرەی ئەم پێناسەیە، دەکرێ گوناحەگەورەو گچکەکان لە یەك جیا بکرێنەوە، بەڵام بە پێی بۆچوون و پێناسەکانی دیکە، ئەو ئامانجە نایەتە دی.

کەواتە: بە کورتیی: هەموو ئەو گوناح و هەڵەو پەڵانەی کە بە دەقێکی شەرعیی ڕاست و ڕاشکاوو، بێ ڕاجیاییەکی ئەوتۆ، گوناح (ذَنْب، إِثْم، خَطَأ، سَيِّئَة، جُرْم) بوونیان ئیسپات بووەو، پێناسەی گوناحەزلەکان (الكبائر)یشیان بەسەردا ناچەسپێ، ئەوە بە گوناحی گچکە دادەنرێن.

## تەوەری سێیەم:

## ئەو هۆیاکەی کە حوکمی گوناحە گچکەکان دەگۆڕن بۆ هی گەورە

لـە باسـەکانی پێشـوودا خسـتمانە ڕوو، کـە بـە دوورەپەرێزیـی (إجتنـاب) لـە گونـاح و تاوانـە زلـەکان، وردە گوناحەکانـی ئینسـان دەبەخشـرێن، بـەڵام ئەمـە لـە کاتێکدایـە کـە ئـەو گوناحـە گچەکانـە، لـە ئەنجامـی چەنـد هۆکارێکـەوە حوکمەکەیـان نەگۆڕابێ بـۆ هـی گوناحـی گـەورە، چونکـە لـەو کاتـەدا ئەوانیـش مەگـەر بـە تۆبەیەکـی ڕاسـت و سـاغ، ئەگەرنـا تەنیـا بـە دەسـت لـێ هەڵگرتنـی گوناحـە زلـەکان لاناچـن و نابەخشـرێن، ئنجـا گرنگتریـنی ئـەو شـتانەی کـە حوکمـی گوناحـە گچکـەکان دەگـۆڕن بـۆ گـەورە، ئەمانـەن:

### یەك: بەردەوام بوون (المواظبة):

بەڵێ یەکێك لەو هۆکارانـەی کـە حوکمـی گوناحـی گچکـە دەگـۆڕن بـۆ گـەورە، بریتیـە لـە دووبـارە کردنـەوەو بـەردەوام بـوون لـە سـەری، وەك ئایەتـی:

﴿ كَلَّا بَلْ رَانَ عَلَىٰ قُلُوبِهِم مَّا كَانُوا يَكْسِبُونَ ﴾[1].

هەروەهـا فەرمـوودەی: {إِنَّ الْمُؤْمِـنَ إِذَا أَذْنَـبَ كَانَـتْ نُكْتَـةٌ سَـوْدَاءُ فِي قَلْبِـهِ، فَـإِنْ تَـابَ وَنَـزَعَ وَاسْـتَغْفَرَ، صُقِـلَ قَلْبُـهُ، فَـإِنْ زَادَ زَادَتْ، فَذَلِـكَ الـرَّانُ الَّـذِي ذَكَـرَهُ اللَّـهُ فِي كِتَابِـهِ ((كَلَّا بَـلْ رَانَ عَـلَى قُلُوبِهِـمْ مَـا كَانُـوا يَكْسِبُونَ))}[2]، واتـە: بڕوادار کـە گوناحـی

---

(١) المطففين :١٤.

(٢) أخرجه ابن ماجه: ٤٢٤٤، وصححه الألباني.

کرد، خاڵێکی ڕەش لـە دڵیدا پەیدا دەکات، ئنجا ئەگەر گەڕایەوەو دەستی هەڵگرت و داوای لێبوردنی کرد، دڵی سپیی و ساف دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر گوناحی زیادکردن، خاڵە ڕەشەکانیش زۆر دەبن، هەتا دەبێتە ئەو ژەنگەی کە خوا لـە کتێبەکەیدا باسی کردوە: (نەخێر، بەڵکو کردەوە خراپەکانیان ژەنگی لەسەر دڵیان پەیدا کردوە).

چونکە هـەم ئایەتەکەو، هـەم فەرمایشتەکەش بـە گشتیی باسی گوناحیان کردوەو، تایبەتیان نەکردوە بـە هـی گـەورەوە.

## دوو: سووربوون (الإصرار) لەسەر کردنی:

ئەمیش هۆیەکی دیکەی گەورەکردنی حوکمی گوناحی گچکەیەو، جیاوازیشی لەگەڵ بەردەوام بوون، ئەوەیە کە بەردەوام بوون حاڵەتی کردەیی و، سووربوونیش حاڵەتی دەروونیی و عـەزم لەسەر دامەزراندن دەگرێتـەوە، چونکـە زانایان لـە مانای (إصرار)دا گوتوویانە[1]: (إن الإنسان يؤاخَذ بما وطَّن عليه ضميره وعَزَم عَليه بقلبه من المعصية)، واتە: بێگومان مرۆڤ لەسەر هەر جۆرە سەرپێچییەك کە دڵی لەسەرکردنی چەسپاندوە، لـە دەروونییدا ڕەگی داکوتاوە، سزا دەدرێ.

پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەوبارەوە فەرموویەتی: {ارْحَمُوا تُرْحَمُوا وَاغْفِرُوا يَغْفِرْ اللَّهُ لَكُمْ، وَيْلٌ لِأَقْمَاعِ الْقَوْلِ، وَيْلٌ لِلْمُصِرِّينَ الَّذِينَ يُصِرُّونَ عَلَى مَا فَعَلُوا وَهُمْ يَعْلَمُونَ}[2] ، واتە: بەزەیی بنوێنن بەزەییتان بەرانبەر دەنوێنرێ (لەلایەن خواوە)و، لـە خەڵکی ببوورن لێتان دەبووردرێ، سزای سەخت بۆ قسەی خەڵك هەڵگرەوان[3]، سزای سەخت بۆ سووربووان (لەسەر گوناح).

---

(١) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن) ج٤، ص ٢١٥.

(٢) أخرجه أحمد: ٦٥٤١، والبخاري في الأدب المفرد: ٣٨٠، وقال شعيب الأرناؤوط: إسناده حسن.

(٣) وشـەی (أقماع) کـۆی (قمع، قمعة)یـە کـە جۆرە مێشێکی شینەو لـە کـۆڵ کـەرو ئێسترو ئەو جۆرە وڵاخانـە نایێتـەوە، بەکوردیی (مێشکەرە)و (کەرمـۆزە ـ خەرەنگەز)ی پێ دەڵێن، ئنجا کەسانێکیش کە قسەی خەڵکی هەڵدەگرنەوەو دەیگێڕنەوە، بەو جۆرە زیندەوەرە شوبهێنراوان، بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص٦٨٤.

## سێ: بە گچكەو كەم سەیركردنی گوناح:

ئەمیش هۆكارێكی دیكەی گەورەبوونی حوكمی گوناحە گچكەكانە، لەوبارەشەوە چەند فەرموودەیەك لە پێغەمبەری خواوە (صلى الله علیه وسلم) هاتوون، بۆ وێنە:

١- {عَنْ عَائِشَةَ أَنَّ رَسُول اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ يَا عَائِشَةُ! إِيَّاكِ وَمُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ فَإِنَّ لَهَا مِنَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ طَالِبًا}[١] ، واتە: ئەی عائیشە! خۆت لە گوناحە بەكەم دانراوەكان بپارێزە، چونكە لە لایەن خوای زاڵ و پایە بەرزەوە داواكەریان هەیە.

٢- {إِيَّاكُمْ ومُحَقَّرَاتِ الذُّنُوبِ، فَإِنهُنَّ يجتمعن عَلَى الرَّجُل حَتَّى يهلكنه}[٢] ، واتە: لە گوناحە بەكەم ژمێردراوەكان وریابن، چونكە لەسەر كابرا كەڵەكە دەبن، هەتا دەیفەوتێنن.

{عَنْ أَنَسٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ قَالَ: إِنَّكُمْ لَتَعْمَلُونَ أَعْمَالًا هِيَ أَدَقُّ فِي أَعْيُنِكُمْ مِنْ الشَّعرِ، إِنْ كُنَّا لَنَعُدُّهَا عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ مِنْ الْمُوبِقَاتِ}[٣]، واتە: ئەنەسی كوڕی مالیك (خوا لێی ڕازی بێ) گوتوویەتی: ئێوە هەندێك كردەوان دەكەن، لەبەرچاوتان لە (موو) باریكترن، ئێمە لە ڕۆژگاری پێغەمبەردا (صلى الله علیه وسلم) لە گوناحە فەوتێنەرەكانمان دەزانین.

## چوار: پێ دڵخۆشبوون:

دڵخۆشبوون بە گوناحی گچكەش، هۆیەكی دیكەی زلبوونی حوكمەكەیەتی، چونكە بابای گوناحكار، دەبێ بە گوناح و هەڵەكانی دڵتەنگ و ناڕەحەت و خەفەتبار بێ، مادام دەزانێ كە خوای بەرزو مەزن ئەو ڕەفتارەی پێ ناخۆشە،

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٢٨٦٠، قال شعيب الأرناؤوط: إسناده قوي.

(٢) أخرجه أحمد: ٣٨١٨، والطبراني في الكبير: ١٠٥٠٠، وفي الأوسط: ٢٥٢٩، قال الهيثمي (١٨٩/١٠): رجاله رجال الصحيح، وقال المناوي (١٢٨/٣): قال الحافظ العراقي: إسناده جيد.

(٣) أخرجه البخاري: ٦١٢٧.

بەڵگـەی ئیســپاتی ئـەم هـۆکارەش، لەکاتـی خسـتنەڕووی هـۆکاری پێنجەمـدا بـاس دەکەیـن.

## پێنجەم: بە ئاشکرا ئەنجام دانی و نەشاردنەوەی:

ئەمیـش هۆیەکـی دیکـەی بـە گەورەدانانـی حوکمـی وردە گوناحەکانـەو، ئـەم فەرموودەیـەش بەڵگەیەتـی و بەڵگـەی (پـێ دڵخـۆش بوون)یشـە، چونکـە کەسـێك بـە گونـاح و هەڵـەو خراپەیـەك دڵخـۆش نەبـێ و شـانازیی پێـوە نـەکات، ئاشـکرای نـاکات!

{عَـنْ أَبِي هُرَيْـرَةَ رضي اللـه عنـه، يَقُـولُ: سَـمِعْتُ رَسُـولَ اللَّـهِ صَـلَّى اللَّـهُ عَلَيْـهِ وَسَـلَّمَ يَقُـولُ كُلُّ أُمَّتِـي مُعَـافًى إِلَّا الْمُجَاهِرِيـنَ، وَإِنَّ مِـنْ الْمُجَاهَـرَةِ أَنْ يَعْمَـلَ الرَّجُـلُ بِاللَّيْـلِ عَمَـلًا، ثُـمَّ يُصْبِـحَ وَقَـدْ سَـتَرَهُ اللَّـهُ عَلَيْـهِ فَيَقُـولَ: يَـا فُلَانُ عَمِلْـتُ الْبَارِحَـةَ كَـذَا وَكَـذَا وَقَـدْ بَـاتَ يَسْـتُرُهُ رَبُّـهُ، وَيُصْبِـحُ يَكْشِـفُ سِـتْرَ اللَّـهِ عَنْـهُ}[1]، واتـە: هەمـو ئوممەتـی مـن سـەلامەت دەبـن بێجگـە لـە بـە ئاشـکرا گوناحـکاران و، لـە بـێ ئابڕووییـە کـە کابـرا بـە شـەوێ کردەوەیـەك (مەبەسـت گوناحـە) بـكات، کەچـی بەیانـی کـە خـوا بـۆی پۆشـیوە، هەڵسـێ و بڵـێ: هـۆ فلانکـەس! دوێنـێ شـەوێ ئـاواو ئـاوام کـرد! پـەروەردگاری بەشـەوگار بـۆی پۆشـیوە، کەچـی بەیانـی پـەردەی خـوا لەسـەر خـۆی لادەبـات!

دیـارە لـەم فەرموودەیەشـدا پێغەمبـەر (صلـی اللـە علیـە وسـلم) بـە گشـتیی نـاوی گوناحـی هێنـاوەو، گـەورەو گچکـەی دەگرێتـەوە.

## شەش: هەڵخەڵەتان بە پۆشینی خوا:

ئەمیـش هۆکارێکـی دیکـەی گواسـتنەوەی حوکمـی وردە گوناحەکانـە لـە گچکەوە بـۆ گـەورە، چونکـە ئاشـکرایە کـە دڵنیابـوون (أمن)لـە نەخشـەو پـلان (مكـر)ی خـوای دادگـەر، یەکێکـە لـە گوناحـە زلـەکان، وەك خـوا فەرموویەتـی:

(١) أخرجە البخاري: ٥٧٢١، ومسلم: ٢٩٩٠.

﴿ أَفَأَمِنُواْ مَكۡرَ ٱللَّهِۚ فَلَا يَأۡمَنُ مَكۡرَ ٱللَّهِ إِلَّا ٱلۡقَوۡمُ ٱلۡخَٰسِرُونَ ﴾[(١)]

دەجا بابای سەرگەرمی گوناحی گچکەش، کە خوا بە لوتفی خۆی ماوەیەك بۆی پۆشیوە، ئەگەر بەو پۆشینەی خوا فریوی خواردو دڵنیابوو، مانای وایە ئەو خەسڵەتە کوشندەو بێڕەزایەی تێدا هاتۆتەدی.

(الزبیدي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (الإغترارُ بِسِتْرِ الله والإستخفاف بِحِلْمِهِ وإن كان صغيرة، ولكنه يكبُرُ، لأنه يتسببُ منهُ الأمْنُ من مكر الله وهو كبيرةٌ) [(٢)]، واتە: هەڵخەڵەتان بە پۆشینی خواو گوێ پێ نەدانی هێدیی و مەندیی خوا، ئەگەر گچکەش بێ، بەڵام لە ئەنجامی ئەوەدا کە ئەمین بوون لە تەگبیری خوای لێ دەکەوێتەوە، کە گوناحی گەورەیە، ئەویش گەورە دەبێت.

## حەوت: ئەنجامدرانی گوناحی گچکە لەلایەن زانایەکی پێشڕەو و چاو لێکراوەوە:

ئەمیش هۆکارێکی دیکەی مەترسییدارو کاریگەری گەورەبوونی حوکمی گوناحی گچکەیە، چونکە بابای زاناو پێشەوا، خەڵك سەرنجی دەدەن و حەڵاڵ و حەرامی لێ فێر دەبن و وەردەگرن و، گوناحێکی گچکەی کە زاناو پێشەوایەك دەیکات، بۆ وێنە: ڕیش تاشین، جگەرە کێشان، ڕوانینی حەرام..هتد، لە ئەنجامی ئەوەدا کە خەڵکی چاوی لێ دەکەن و پەیڕەویی لێ دەکەن، چەندان کەس ئەو گوناحانە دەکەن و، ڕەنگە هەر بە گوناحیشیان دانەنێن، چونکە لە فڵانە مەلاو مامۆستایان بینیوە!!

(الإمام أبو حامد الغزالي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (أن تصدر الصغيرة عن عَلَمٍ يُقتدى به، فذلك عظيم لأنه يبقى بعد موته) [(٣)]، واتە: گوناحی گچکە

---

(١) الأعراف :٩٩.

(٢) بڕوانە (إتحاف السادة المتقين..) ج٨، ص٥٧٢.

(٣) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٤، ص ٣٣.

ئەگەر لە زانایەکی پەیڕەویی لێ کراوەوە دەربچێ، ئەوە گەورەیە، چونکە پاش مردنیشی هەر دەمێنێ.

دیارە وەك پێشتر گوتمان، نەك تەنیا دوای مردنی، بەڵکو هەر لە حاڵی ژیانیشدا بڵاودەبێتەوەو تەشەنە دەكات و، ئایەتی: ﴿ وَلَيَحۡمِلُنَّ أَثۡقَالَهُمۡ وَأَثۡقَالٗا مَّعَ أَثۡقَالِهِمۡۖ وَلَيُسۡـَٔلُنَّ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ عَمَّا كَانُواْ يَفۡتَرُونَ ﴾[1]، یان، بەسەردا دەچەسپێ و دەکەونە بەر حوکمی فەرمایشتی (صلى الله عليه وسلم): {..ومَنْ سنَّ سنة سيئة، كان عليه وزرها و وزر مَنْ عَمِل بها مِنْ بعده...}[2]، واتە: هەرکەسێك ڕێی خراپەیەك بشکێنێ، ئەوە گوناهی خۆیشی لەسەرەو، هی ئەوانەش کە دوای وی ئەنجامی دەدەن.



---

(١) العنكبوت: ١٣.

(٢) أخرجه مسلم: ١٦٧٧.




# شوێنەواری خراپ و شووم و زیانی گوناح و تاوان، بۆ تاك و كۆمەڵ

١- لە ژیانی تاكدا.
٢- لە ژیان و گوزەرانی كۆمەڵدا.

بەڕێـــزان!

خوای پەروەردگار دەربارەی پێغەمبەری کۆتایی و نەخوێندەواری خۆی (محمد بن عبدالله) (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی:

﴿يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ ٱلْخَبَٰٓئِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَٱلْأَغْلَٰلَ ٱلَّتِى كَانَتْ عَلَيْهِمْ﴾[1].

واتە: فەرمانیان پێ دەکات بە هەرچی چاك و پەسەندەو، لە هەرچی شتی خراپ و نا پەسەندە دەیانگێڕێتەوەو، هەرچی شتی پاك و سوود بەخشە بۆیان حەڵاڵ دەکات و، هەرچی پیس و زیانبەخشە لێیان قەدەغە دەکات و، باری قورسیان و ئەو کۆت و زنجیرانەی پێیانەوەن، لێیان لادەبات.

لەم ئایەتەوەو لە چەندان دەقی دیکەی قورئان و سوننەتەوە دەدرەوشێتەوە، کە خوای کاربەجێ هەرچی بۆ بەندەکانی پەسەندی کردوە، سەر لەبەر بەرژەوەندیی و خێرو خۆشییە بۆیان و، هەرچی پێشگیریشی لێیان کردوە، زەرەرو زیانی ڕووتەو، شتی پاك و چاك و سوودبەخش نەبێ، بۆی حەڵاڵ نەکردوون و، جگە لە شتە پیس و خراپ و زیانبەخشەکانیشی، لێ قەدەغە نەکردوون! دیارە ئەم ڕاستییەش بە بێ ئیمان و قەناعەت پێ هێنانی بێ لەرە لەر (بلا تذبذب)ی، ئینسان نابێتە مسوڵمان، بەڵام بە زیاترو چاکتر تێوەڕامان و سەرنج دانی شەریعەت و ڕێساو یاساکانی، دەبێتە قەناعەتێکی پتەوترو قووڵتر، کەواتە: هەر بە گشتیی گوناح و تاوانەکان، تێکڕایان وێڕای قیامەت و دوارۆژ، بۆ ژیانی دنیای تاك و کۆمەڵیش پیس و خراپ و زیانبەخش و بەزەڕن و، درەختی ژەقنەمووتی بابای تەیری گول ئاساو بەد فەڕن، بەڵام با سەرنجی ژمارەیەك لە زەرەرو زیانە تاکیی و کۆمەڵایەتییەکانیشیان بدەین، بەر لەوەش پێویستە ئەو ڕاستییەمان لە بیر نەچێ، کە زیانی هەرە گەورەو کوشندەی گوناح و سەرپێچیی و خراپەکان، ئەوەیە کە لە ڕۆژی دواییدا دەردەکەوێ و، دەبێتە مایەی ڕوو زەردیی ئینسان و، سەرشۆڕیی و زەبوونیی و، گیرۆدەی سزاو جەربەزەی دۆزەخ بوون، خوا بە کەرەمی خۆی پەنامان بدات.

---

(١) الأعراف :١٥٧.

## یەکەم: شوێنەواری شومی گوناح لە ژیانی تاکـدا

### یەك: بێهێزبوونی ئیـرادە:

وەك چـۆن ئیـرادەی ئینسـان بەهـۆی طاعـەت و چاکەکارییـەوە بەهـێزو پتـەو دەبێ، لـە ئەنجامـی گونـاح و خراپەکاریی و تاوانیشدا بێ هێزو لـەرزۆك دەبێ و، ئەمـەش شتێکە تاقیکراوەتـەوەو زانـراوە(١)، بابای لاڕێ و خراپەکارو گیـرۆدە بـوو بە گوناحەوە، لـە بەرانبـەر نەفس و ئـارەزووە ناڕەوایەکانیدا، یەکجار دەستە پاچەو کلۆڵـەو، هیـچ جۆرە بەرهەڵستییەکی بۆ ناکرێ و، بەدەست شـەیتان و نەفسـەوە دیـل و زەلیـل بـووە!

### دوو: بوونە بازیچەو ئامڕازی یاریی، بەدەست شەیطانەوە:

دیـارە گونـاح و تاوانـەکان تـۆڕو تەڵـەو داوای شـەیتانن و، ئینسانەکانیان پێ ڕاو دەکات! جـا خـوای دادگـەر فەرموویەتـی: کـە شـەیتانەکان دەبنـە دۆسـت و هـاوڕازی بێبڕوایـان و خراپـەکاران:

﴿...إِنَّا جَعَلْنَا ٱلشَّيَٰطِينَ أَوْلِيَآءَ لِلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ ﴿٢٧﴾ وَإِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً قَالُواْ وَجَدْنَا عَلَيْهَآ ءَابَآءَنَا﴾(٢)

واتـە: بێگومـان ئێمـە شـەیتانەکانمان کردوونـە دۆسـتی ئەوانـەی ئیمانیـان نیـە و، کاتێك کارێکی ناقـولا دەکـەن دەڵێـن: بـاب و باپیرانمـان بینـی وایـان دەکـرد..!

---

(١) چەندان کەسی گیرۆدە بووی گوناح و تاوان، سەری خۆیان لە سەرخۆشیی و ڕابواردن و لەززەتی ڕواڵەتی درۆیینەی ئەو گوناحانە داناوە، خۆیان بە فەتارەت داوە!

(٢) الأعراف:٢٧-٢٨.

﴿ وَمَن يَعْشُ عَن ذِكْرِ ٱلرَّحْمَٰنِ نُقَيِّضْ لَهُۥ شَيْطَٰنًا فَهُوَ لَهُۥ قَرِينٌ ﴾[١].

واتـە: هەرکەسێك لـە ئاست یـادی (خـوا)ی بەخشـندەدا کوێربێ، شـەیتانێکی بۆ ساز دەکەیـن کـە دەبێتـە هـاوڕازی..

بەڵـێ وەك چـۆن ئینسـان هەتـا خواپەرسـتترو چاکەکارتـر بـێ، لـە لای خـواو بەرێزانـی بـاڵا (الملأ الأعلی) خۆشەویشـتتر دەبێ و، زیاتـرو چاکتـر هـاوکاری خێرو چاکـەی دەکـرێ، بەهەمـان شـێوەش، هەتـا کافـرو بێدینتـرو خراپەکارتریـش بـێ، لـە شـەیتانەکان نزیکتـر دەبێ و، پتـر دەیخەنـە ژێـر ڕکێـف و کۆنتڕۆڵـی خۆیانـەوە.

## سـێ: نەمانی چاکەو خێروخۆشیی و، گرفتاربوون بە ژین تاڵیـی و شـپرزە حاڵییەوە:

ئەمیـش یەکـی دیکەیـە لـە شـوێنەوارە شـووم و نەگبەتەکانـی گونـاح و تـاوان لـە ژیانـی مرۆڤـداو، دەقـی قورئـان و سـوننەت لەوبـارەوە زۆر زۆرن، کـە بەختەوەریـی و خێرو خۆشـیی مەعنەویـی و، هەرزانیـی و نـازو نیعمـەت و پیـت و پێـزی ماددیـی، زادەو بەرهەمـی ئیمـان و پارێزگاریـی و چاکەکارییـەو، پێچەوانەکانیشـیان زادەو بەرهەمـی کوفـرو خراپەکاریـی و تاوانبارییـن، بـۆ وێنـە:

١- ﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾[٢].

واتـە: هەرکەسێك ڕوو لـە بەرنامـەی مـن وەربگێـڕێ، ئـەوە بێگومـان گوزەرانێکی تەنـگ و تاڵـی دەبێ.

٢- ﴿ وَمَآ أَصَٰبَكُم مِّن مُّصِيبَةٍ فَبِمَا كَسَبَتْ أَيْدِيكُمْ ﴾[٣].

---

(١) الزخرف:٣٦.

(٢) طه :١٢٤.

(٣) الشوری :٣٠.

واتە: هەر بەڵایەکتان تووشبێ، بەهۆی (گوناحەکانی) کردەی دەستی خۆتانە.

٣- {لا يَزِيدُ فِي العُمرِ إلاَّ البِرُّ، ولا يُرَدُّ القَدَر إلاَّ الدَّعَاءُ، وإنَّ الرَّجُلَ لَيُحْرَمُ الرِّزق بالذَّنْب يُصيبه}[١]، واتە: تەنها چاکەکاریی تەمەن زیاد دەکات و، بەس پاڕانەوە قەدەر دەگێڕێتەوەو، جاری وایە کابرا ڕۆزییەکی لێ دەگێڕرێتەوە بەهۆی گوناحێکەوە کە دەیکات.

شایانی باسیشە کە نەخۆشیی و گرێیە دەروونیی و کۆمەڵایەتییەکان، کە ئێستا سەرتاپای جیهانی ڕۆژئاوا بە تایبەت و دنیای کوفریان بەگشتیی گرتۆتەوە، وەك بە تەجرەبەو لە واقیعدا دیارەو، پزیشك و پسپۆڕانی دەروونناس و کۆمەڵناسیش دەڵێن: زادەو بەرهەم و هەڵقوڵاوی واقیع و بارودۆخی کافرانەو تاوانبارانەو خراپەکارانەی، ئەو کۆمەڵگا لارێ و سەرگەردانە بە ڕواڵەت پێشکەوتوو و بەختەوەرو، لەڕاستییدا دواکەوتووو ژینتاڵانەن!



(١) أخرجه أحمد: ٢٢٤٤٠، وابن ماجه:٤٠٢٢، والحاكم: ١٨١٤، وقال: صحيح الإسناد.

## دووەم: لە ژیانی کۆمەڵگادا

خوێنەری بەڕێز!

وەنەبێ گوناح و خراپەکاریی تەنیا لە ژیانی تاکدا، شوێنەواری شوومی هەبێ، بەڵکو زیان و ماڵ وێرانییەك کە گوناح و تاوان پەیدای دەکەن، کۆمەڵگاو میللەتیش دەگرێتەوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَٱتَّقُواْ فِتۡنَةً لَّا تُصِيبَنَّ ٱلَّذِينَ ظَلَمُواْ مِنكُمۡ خَآصَّةًۖ ﴾[1].

واتە: لە بەڵایەك خۆتان بپارێزن کە تەنیا ئەوانەتان ناگرێتەوە کە ستەمیان کردوە... بەڵێ سزادانی میللەتان و کۆمەڵگایەکان بەهۆی گوناح و تاوانەکانیانەوە، یەکێکە لە یاسا (سُنّة)کانی خوا لە مێژووی مرۆڤایەتییدا، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَإِلَىٰ مَدۡيَنَ أَخَاهُمۡ شُعَيۡبٗا فَقَالَ يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱرۡجُواْ ٱلۡيَوۡمَ ٱلۡأٓخِرَ وَلَا تَعۡثَوۡاْ فِي ٱلۡأَرۡضِ مُفۡسِدِينَ ٣٦ فَكَذَّبُوهُ فَأَخَذَتۡهُمُ ٱلرَّجۡفَةُ فَأَصۡبَحُواْ فِي دَارِهِمۡ جَٰثِمِينَ ٣٧ وَعَادٗا وَثَمُودَاْ وَقَد تَّبَيَّنَ لَكُم مِّن مَّسَٰكِنِهِمۡۖ وَزَيَّنَ لَهُمُ ٱلشَّيۡطَٰنُ أَعۡمَٰلَهُمۡ فَصَدَّهُمۡ عَنِ ٱلسَّبِيلِ وَكَانُواْ مُسۡتَبۡصِرِينَ ٣٨ وَقَٰرُونَ وَفِرۡعَوۡنَ وَهَٰمَٰنَۖ وَلَقَدۡ جَآءَهُم مُّوسَىٰ بِٱلۡبَيِّنَٰتِ فَٱسۡتَكۡبَرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ وَمَا كَانُواْ سَٰبِقِينَ ٣٩ فَكُلًّا أَخَذۡنَا بِذَنۢبِهِۦۖ فَمِنۡهُم مَّنۡ أَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِ حَاصِبٗا وَمِنۡهُم مَّنۡ أَخَذَتۡهُ ٱلصَّيۡحَةُ وَمِنۡهُم مَّنۡ خَسَفۡنَا بِهِ ٱلۡأَرۡضَ وَمِنۡهُم مَّنۡ أَغۡرَقۡنَاۚ وَمَا كَانَ ٱللَّهُ لِيَظۡلِمَهُمۡ وَلَٰكِن كَانُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ يَظۡلِمُونَ ﴾[2].

---

(١) الأنفال :٢٥.

(٢) العنكبوت:٣٦-٤٠.

وەك دەبینیـن پـاش گێڕانـەوەو ئامـاژە پێکردنـی بەسـەرهاتی سـەربەفەتارەت چوونـی ژمارەیەك لەگەل و کۆمەڵە لاڕێ و سەرکەشەکان و طاغووتە خۆبەزلگرەکان، فەرمووییەتی: (فـكلاً أخذنـا بِذنبِـهِ)، هەرکامێکیانمـان بەهـۆی گوناحەکەیـەوە گـرت و سـزادا!!

ئنجا دەتوانیـن ئاماژە بـە سێ جۆرە شـوێنەواری شـووم و بـەدی گونـاح و تـاوان، لـە ژیانـی کۆمەڵگاو گەلانـدا بکەیـن:

## یەك: پەرتەوازەو پەڕاگەندە بوون، بۆ چەند تاقم و پێڕێکی پێکەوە دژو ناکۆك:

دیـارە ئـەم دەردو نەخۆشـیی دابـڕ دابـڕ بـوون و پەرتـەوازە بوونـە، پیسـترین و کوشـندەترین و بێڕەزاتریـن شـوێنەواری شـوومی خراپەکاریـی و گوناحباریـی و لاریـی و لاساریی گـەل و کۆمەڵگایـەو، هـەر گـەل و کۆمەڵێـك گیـرۆدەی ئـەم نەخۆشییە گورچك بڕە بوو، لـە هیـچ نـازو نیعمەتێك بەهرەمەنـد نابێ و، هیـچ خێـرو خۆشـییەك لـە خـۆی نابینـێ! هـەر بۆیـەش خـوای دادگـەرو کاربەجـێ بـە پێغەمبـەری خـۆی (صلـى الله عليـه وسـلم) ڕاگەیانـدوە، کـە هـەر کەسـێك ببێتـە مایـەی دابڕدابڕبوون لـە یـەك پچڕاندنـی شیرازەی میللـەت و کۆمـەڵ، ئـەوە فـڕی بەسـەر تـۆوە نامێنـێ و لـە بازنـەی ئیسـلام دەچێتـە دەرێ:

﴿ إِنَّ ٱلَّذِينَ فَرَّقُواْ دِينَهُمۡ وَكَانُواْ شِيَعٗا لَّسۡتَ مِنۡهُمۡ فِي شَيۡءٍ ﴾[(١)].

هەروەهـا خـوای پـەروەردگار وەك تۆڵـەو سـزاو جەزرەبەیـەك، هەڕەشـەی بـە پەیداکردنـی ناکۆکیـی و دووبەرەکیـی (النـزاع و الصـراع) لـە ئۆممەتـی ئیسـلام کـردوە، کـە لـە ئەنجامـی لادان و خراپـەو تاوانەکانیانـدا، گیـرۆدەی دەبـن و فەرموویەتـی:

﴿ قُلۡ هُوَ ٱلۡقَادِرُ عَلَىٰٓ أَن يَبۡعَثَ عَلَيۡكُمۡ عَذَابٗا مِّن فَوۡقِكُمۡ أَوۡ مِن تَحۡتِ أَرۡجُلِكُمۡ أَوۡ يَلۡبِسَكُمۡ شِيَعٗا وَيُذِيقَ بَعۡضَكُم بَأۡسَ بَعۡضٍۗ ﴾[(٢)].

---

(١) الأنعام:١٥٩.
(٢) الأنعام :٦٥.

واتە: (ئەی موحەممەد) بڵێ: (بە ئوممەتەکەت) کە خوا تواناداره کە لەسەرەوەتانەوە بەڵاتان بۆ بنێرێ، یان لە ژێر پێتانەوە، یان بتانکاتە چەند پێڕو تاقمێکی تێکەڵ و پێکەڵ و، زەبرتان پێ لە یەکدی بوەشێنێ و بەگژ یەکدیتاندا بکات.

## دوو: گیرۆدەبوون بە جۆرەها بەڵاوگرفتاریی و مەینەتییەوە:

شوێنەوارێکی دیکەی شوومی بەدڕەفتاریی و گوناحباریی و بێ بەندوباریی، لە ژیان و گوزەرانی میللەتاندا، بریتییە لە گیرۆدەبوون بە بەڵاو مەینەتییە جۆراو جۆرەکانەوە، ئەم ڕاستییەش زۆر لە دەقەکانی قورئان و سوننەت داکۆکیی لەسەر دەکەن، بۆ وێنە:

١- ﴿ وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ ٱلْقُرَىٰٓ ءَامَنُوا۟ وَٱتَّقَوْا۟ لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَـٰتٍ مِّنَ ٱلسَّمَآءِ وَٱلْأَرْضِ وَلَـٰكِن كَذَّبُوا۟ فَأَخَذْنَـٰهُم بِمَا كَانُوا۟ يَكْسِبُونَ ﴾[١].

واتە: ئەگەر هاتباو خەڵکی ئاوەدانییەکان ئیمانیان هێنابایەو پارێزکارییان کردبایە، ئەوە مسۆگەر پیت و پێزی ئاسمان و زەمینمان بەسەردا هەڵدەڕشتن، بەڵام (لە جیاتی ئەوە) بێبڕوا بوون، بۆیە بەهۆی کردەوە (خراپە)کانیانەوە، گرتمانن و سزامان دان.

٢- ﴿ وَضَرَبَ ٱللَّهُ مَثَلًا قَرْيَةً كَانَتْ ءَامِنَةً مُّطْمَئِنَّةً يَأْتِيهَا رِزْقُهَا رَغَدًا مِّن كُلِّ مَكَانٍ فَكَفَرَتْ بِأَنْعُمِ ٱللَّهِ فَأَذَٰقَهَا ٱللَّهُ لِبَاسَ ٱلْجُوعِ وَٱلْخَوْفِ بِمَا كَانُوا۟ يَصْنَعُونَ ﴾[٢].

واتە: خوا وێنەیەکی هێنایەوە: ئاوەدانییەکی بێ ترس و ئارام (هەبوو) کە لە هەموو شوێنێکەوە بژێوی بۆ دەهات بە فراوانیی، بەڵام (لە جیاتی سوپاسگوزاریی) بەرانبەر بە چاکەو نیعمەتەکانی خوا، سپڵەیی کرد، خواش

---

(١) الأعراف :٩٦.

(٢) النحل :١١٢.

پۆشـاکی برسـیەتیی و ترسـی بـە بەرداکـردن و پێیانـی چێژتـن، لـە سـۆنگەی ئـەو (گوناحـان)ەوە کـە دەیانکـردن.

**٣**- ((عن عبدالله بن عمر رضي الله عنهما قال: أقبل علينا رسول الله(صلى الله عليه وسلم) فقال: يا معشر المهاجرين: خمسٌ إذا ابتُليتُم بهنَّ، وأعوذ بالله أن تُدرِكُوهُنَّ:

**أ**- لم تَظهَر الفاحشـــةُ فـي قومٍ قَطُّ حتَّى يُعْلِنوا بها، إلاّ فشـافيهم الطـــاعُون والأَوجاعُ الَّتي لم تكن فـي أسلافِهِم الذين مَضَوْا.

**ب**- ولم ينْقُصُوا المكيـالَ والميزانَ، إلاّ أُخِذُوا بالسِّـنينَ وشدّة المُؤْنةِ وجَوْرِ السُلطانِ عليهم.

**ج**- ولم يَمْنَعوا زكـاة أموالهم، إلاّ مُنِعوا القَطْرَ من السماء، ولولا البهـائُم لم يُمْطَروا.

**د**- ولم يَنقُضُوا عَهدَ الله وعَهدَ رسولِهِ، إلاّ سـلَّط الله عليهم عَدُواً من غيـرهم، فَأَخذوا بَعضَ ما فـي أَيدهِم.

**هـ**- وما لَمْ تَحكُمْ أَئِمَّتُهُمْ بِكتابِ اللهِ، ويَتَخيَّروا ممّا أنزلَ الله، إلا جَعَلَ الله بَأْسَهُمْ بَينَهُم))[١].

واتـە: پێغەمبـەری خوا (صلى الله عليـه وسـلم) ڕووی تێکردیـن و فەرمـووی: ئـەی کۆمەڵـی کۆچکـەران! پێنـج (گونـاح) هەرکاتێـك گیرۆدەیـان بـوون[٢]و، پەنـا دەبەمـە بـەر خـوا کـە پێیـان ڕابگـەن:

**١**- بێ ئابڕوویی هەرگیز بە شێوەیەك کە بە ئاشکرا بیکەن، لە نێو هیچ گەلێکدا پەیدا نەبووە، مەگەر تاعوون و دەردو نەخۆشیی وا کە لە پێشووەکانیاندا نەبوون، لەنێویان بڵاوبۆتەوە.

---

(١) أخرجه ابن ماجه: ٤٠١٩، والحاكم: ٨٦٢٣، وقال: صحيح الإسناد، والبيهقي في شعب الإيمان: ٣٣١٥.

(٢) وەڵامەکەی قرتێنراو (محذوف)ە، چونکە سیاقی فەرمایشتەکەو دواییەکەی دەیگەیەنێ، کە بریتییە لە تووشبوونی ئەو پێنج شتانەی خراونەتە ڕوو: نەخۆشیی تازە، گرانیی و قات و قڕیی...هتد.

٢- هیچ کاتێك (کۆمەڵێك)کێشان و پێوانیان بە ناتەواویی نەکردوە، مەگەر گرانیی و قات و قڕیی و ستەمی حوکمڕانیان بە ملدا هاتوە.

٣- هەرکاتێك (کۆمەڵێك) زەکاتیان لە ماڵ و سامانیان نەدابێ، حەتمەن بارانی ئاسمانیان لێ گیراوەتەوەو، ئەگەر لەبەر ئاژەڵ نەبووایە، هیچیان بۆ نەدەباری.

٤- هیچ کاتێك (کۆمەڵێك) پەیمانی خواو پەیمانی پێغەمبەرەکەیان نەشکاندوە، مەگەر خوا دوژمنێکی بیانی بەسەریاندا زاڵ کردوە، هەندێك ماڵ و سامانیانی بە تالان بردوە.

٥- مادام حوکمڕانانیان بە کتێبی خوا حوکم نەکەن و، گوڵبژێر بکەن و بەکەیفی خۆیان هەڵبژێرن لەوەدا، کە خوا ناردوویەتە خوار، ئەوە بێگومان خوا بەگژیەکدییان دا دەکا.

## سێ: لە ڕێ ڕاست هەڵەبوون و خۆشویستنی کوێرە ڕێیان:

ئەمیش یەکی دیکەیە لە میوە ژەقنەمووتییەکانی درەختی گوناح و تاوان لە ژیانی میللەت و کۆمەڵگادا، کە لە سۆنگەی لادان و خراپەکانەوە، دووچاری ڕێی ڕاست نەدیتن و، هەق لەبەرچاو بێزران و، ناهەق لەبەرچاو شیرین کران دەبن! خوای پەروەردگار لەوبارەوە فەرموویەتی:

﴿ سَأَصۡرِفُ عَنۡ ءَايَٰتِيَ ٱلَّذِينَ يَتَكَبَّرُونَ فِي ٱلۡأَرۡضِ بِغَيۡرِ ٱلۡحَقِّ وَإِن يَرَوۡاْ كُلَّ ءَايَةٖ لَّا يُؤۡمِنُواْ بِهَا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلرُّشۡدِ لَا يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗا وَإِن يَرَوۡاْ سَبِيلَ ٱلۡغَيِّ يَتَّخِذُوهُ سَبِيلٗاۚ ذَٰلِكَ بِأَنَّهُمۡ كَذَّبُواْ بِـَٔايَٰتِنَا وَكَانُواْ عَنۡهَا غَٰفِلِينَ ﴾[1].

واتە: بێگومان ئەو کەسانەی کە بە ناهەق لە زەویدا خۆیان بە زل دەگرن لە (تێگەیشتنی) ئایەتەکانمیان لادەدەم و، ئەگەر هەموو نیشانەیەك ببینن، ئیمانی پێ ناهێنن و، ئەگەر ڕێی ڕاست بەدی بکەن، نایگرنە بەر، بەڵام

---

(١) الأعراف :١٤٦.

ئەگەر ڕێی چەوت و هەڵە ببینن، دەیکەنە ڕێبازیان، ئەوەش لە سۆنگەی ئەوەوە (سەرەڕای خۆ بەزلگرتن) کە بڕوایان بە نیشانەکانمان نەهێناو لێیان بێئاگابوون.

بەڵێ بەهۆی گوناح و تاوان و خراپەکاریی و بەدڕەفتارییەوە، میللەت دووچاری زەین کوێریی و، دڵڕەش هەڵگەڕان و، لە ڕێی هەق وەرگەڕان و، بەرەو ڕێچکان لادان، دەبن.




# کاریگەریی و بەرهەم و شوێنەواری گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە سڕینەوەی گوناح و چاککردنی ئینساندا

١- کاریگەریی و بەرهەم و شوێنەواری گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە سڕینەوەی گوناحدا

٢- کاریگەریی و بەرهەم و شوێنەواری گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە چاککردنی ئینساندا

**خوێنەری خۆشەویست!**

خوا پشتیوان بێ لەم بەشی حەوتەمەدا، لە دوو تەوەری سەرەکییدا، باسی بەرهەم و شوێنەواری پڕ خێرو بێری تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوا، دەکەین:

**تەوەری یەکەم:** شوێنەواری تۆبە لە سڕینەوەی گوناحدا.

**تەوەری دووەم:** بەرهەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە چاککردنی ئینساندا.

پێویستە ئەوەش بگوترێ: کە شوێنەواری پیرۆزو بەرهەمی بەرەکەتدارو بە پێزی تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای دادگەرو بەخشەر -تبارك و تعالی-، بە شێوەی ڕاستەقینەی، تەنیا لە قیامەت و دوارۆژدا دەزانرێ و ئاشکرا دەبێ، بەڵام بێگومان کردەوە چاکەکان بەر لە قیامەت و دوارۆژیش، بەرهەم و خێرو بێریان هەر دەردەکەوێ و، ئینسان پێش ئەولا لەملا لێیان بەهرەمەند دەبێ.

## تەوەری یەکەم:
## کاریگەریی و شوێنەواری تۆبە لە سڕینەوەی گوناحدا

ئەم تەوەرە لە شەش باسان پێکهاتوە:

### باسی یەکەم: مانای سڕینەوەی گوناح بەگشتیی:

لە قورئانی بە پێزو سوننەتی پێغەمبەری بەڕێزدا (صلى الله عليه وسلم) چەند وشەیەك بۆ گەیاندنی لێبوردنی خواو پۆشین و سڕینەوەی گوناح و تاوانی بەندەکان، پاش تۆبەکردن و داوای لێبوردن لە خوا کردن، بەکارهاتوون و زۆر دووبارە بوونەوە، بە تایبەت ئەم سێ وشەیە:

**المغفرة:** کە (راغب) ئاوا مانای کردوە: (الغُفرانُ والمغفِرة من الله: هو أن يصونَ الله عَبْدهُ من أن يمسه العذاب)، واتە: (مغفرة وغفران) کە لە خواوە بن: ئەوەیە کە خوا بەندەکەی لەوە بپارێزێ کە ئازارو ئەشکەنجە بدرێ، هەروەها مانای پۆشین (سَتر)یش دەگەیەنێ[1]، هەروەها وشەی ناوبراو، بە هەموو شێوە بەکارهێنانەکانیەوە، دوو سەدو هەشت (٢٠٨) جار لە قوررئانێدا هاتوە.

**التّكفير:** کە (راغب) گوتوویەتی: (الكَفْرُ في اللُغة سَتْرُ الشَّيء، و وصف اللَّيل بالكفر لستره الأشخاص، والزراع لستره البذر في الأرض..)[2]، واتە: (كفر) لە زماندا داپۆشینی شتە، بۆیە شەوگار بە (کافر) ناونراوە، چونکە خەڵکی دادەپۆشێ، جووتیاریش بۆیە بە (کافر) وەسف کراوە، چونکە تۆو لە زەویدا پەنهان دەکات.

---

(١) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن)، ص٦٠٩.

(٢) هەمان سەرچاوە: ص (٧١٤-٧١٧).

**العـفــو:** کە (راغب) لـە پێناسـەیدا گوتوویەتی: (عَفَـوْت عَنْـهُ: قصدت إزالـة ذنبـه صارفـاً عنـه، فالمفعـول فــي الحقيقـة متــروك) یانـی: (عفـوت عنـه) ویستم گوناحەکـەی نەهێڵم و لێـی لابـەرم، کەواتـە: بەرکارەکـە لەڕاسـتییدا (لـە ڕسـتەی: (عَفَـوْتُ عَنَـهُ)دا) لابـراوە[1]. مەبەسـتی (راغـب) ئەوەیـە کـە ڕسـتەی (عفـوت عنـه) لـە ئەسـڵدا (عفـوت ذنبـه عنـه) بـووە.

ئنجا زانـاو توێـژەرەوان لەوبـارەوە کـە ئایـا جیاوازیـی نێـوان (مغفـرة)و (تکفـیر) کـە هەردووکیـان واتـای داپۆشـین (سـتر وتغطيـة) دەگەیـەنـن، چییـە؟ ڕاجیاییـان هەیـە:

أ- بەشێکیان گوتوویانە: مادام لە ئەسڵی زماندا، هەردووکیان یەك واتایان هەیە، لە بەکاهێنانی شەرعیشدا، هەروان و هیچ جیاوازییان نیە، هەرکام لە (القرطبـي)و (الخازن)و (النيسابوري) ئەم ڕایەیان لە تەفسیرەکانیاندا پەسەند کردوە[2].

ب- بەشێکیش لە زانایان گوتوویانە: (تکفیر) بۆ دنیایەو (مغفرة)ش بۆ ڕۆژی دواییە، واتە: خوا لە دنیادا گوناح و خراپەی بڕواداران دەپۆشێ و، لە دوارۆژیشدا دەیانبەخشێ. (الآلوسي)یش یەکێکە لەو زاناو توێژەرەوانەی قورئان کە ئەم ڕایەی هەڵبژاردوە[3].

ج- بەشێکی دیکەشیان گوتوویانە: (مغفرة) بۆ گوناحە زلەکان و (تکفیر)یش بۆ وردە گوناحەکانە، (الطبري)یش ئەم ڕایەی هەڵبژاردوەو (رشید رضا)ش ئاماژەیەکی پێکردوە[4].

---

(١) هەمان سەرچاوە: ص٥٧٤.

(٢) بڕوانـە: (الجامـع لأحكــام القــرآن) ج٤، ص ٣١٧، و (لبـاب التأويـل فـي معانـي التنزيــل)، ج١، ص ٣٤٢، و (غرائـب القـرآن ورغائـب الفرقـان) ج٤، ص ١٦٨.

(٣) بڕوانە: (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني) ج٩، ص ١٩٦.

(٤) بڕوانە: (جامع البيان فـي تفسير القرآن) ج٥، ص٢٩، و (تفسير القرآن الحكيم) ج٤، ص٣٠٢.

د- هەندێکیشیان گوتوویانە: (مغفرة) تایبەتە بەو گوناحانەوە کە لە نێوان بەندەو خوادان و، (تکفیر)یش تایبەتە بە تاوانەکانی نێوان بەندەو خەڵکیەوە[١].

دیـارە هـەرکام لـە خاوەنانـی ئـەم ڕاو بۆچوونانـەش، تاڕاددەیـەك توانیویانـە چەنـد بەڵگەیـەك لەسـەر ڕاستیی قسەو ڕایەکانیـان بهیننـەوە، کـە دەرفەتمـان نیـە بیانخەینـەڕوو.

بـەڵام بۆ جیاوازیی و پەیوەندیی نێوان (مغفـرة)و (تکفیـر) پێم وایە ڕای (ابـن قیـم الجوزیـة) لـە هەمـوو ڕایەکانـی دیکـە بەهێزتـرە، هەرچەنـدە ڕای ئەویـش (رشـید رضـا) چەنـد تێبینییەکی لەسـەر خستوونەڕوو[٢].

ڕایەکـەی (ابـن القیم)یـش بـە کورتیـی ئەوەیـە کـە[٣]: (مغفـرة)و (تکفیـر) جـاری وا هەیـە پێکـەوە دێـن و، جـاری واش هەیـە هەرکامیـان بـە تەنیـا، ئنجـا ئەگـەر پێکـەوە بـوون، ئـەوە واتایـان جیـاوازەو (مغفـرة) تایبەتـە بـە گوناحـە گەورەکانـەوەو، (تکفیـر)یش تایبەتـە بـە وردە گوناحەکانـەوە.

دیـارە هـەرکام لـە ئایەتـی: ﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾[٤]، و فەرمـوودەی: {الصَّلـوات الخَمْـس.. كَفَّـارات لِـمَا بَيْنَهُـنَّ مَـا لَـمْ تُغْـشَ الكبائـر}[٥]، پشـتگیریی ڕایەکـەی (إبـن القیـم) دەکـەن.

---

(١) بڕوانە: (تفسیر القرآن الحکیم) ج٤، ص ٣٠، ٣٠٣، کە لـە (الشیخ محمد عبده)وەوە هێناویەتـی.

(٢) هەمان سەرچاوەو بەرگ و لاپەڕە.

(٣) بڕوانە: (مدارج السالکین) ج١، ص٣٠١٠، ٣١٣.

(٤) النساء :٣١.

(٥) أخرجه أحمد: ٩١٨٦، ومسلم: ٢٣٣، والترمذي : ٢١٤.

بەڵام دەعـوای: تایبەت بوونی (ذنـوب) بە گوناحە زلەکانەوەو (سیّئات)یش بە وردە گوناحەکانـەوە، هەرچەنـدە هەندێك دەقـی قورئـان و سـوننەت دەلالەتـی لەسـەر دەکـەن، بـەڵام بـە موتڵەقیی سـەلمێنراو (مُسَلَّم) نیـە، چونکـە دەقـی دیکـەش هـەن، ئـەوە دەگـەیـەنـن کـە هـەم وشـەی (ذنـب) گوناحـی گچکـە[1]و، هـەم (سـيئة)ش[2]، گوناحـی گـەورە دەگرنـەوە.

ئنجا یەکەمیـن و گەورەتریـن شـوێنەواری تۆبـە -کـە مەبەسـتمان تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ (التوبـة النصـوح)ە- ئـەوەیـە کـە: هـەرچـی گونـاح و تـاوان و هـەڵـەو پەڵـەیـە دەیانسـڕێتەوەو لایـان دەبات و، ئینسـانیان لـێ پاك دەکاتـەوەو، وەك پۆشـاکی سـپیی بـە ئـاوی گـەرم و تایـت و صابـوون شـۆراو، خاوێنـی دەکاتـەوە!

خـوای لێبـوردەو بـە بەزەیـی فەرموویەتـی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ تُوبُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ تَوۡبَةً نَّصُوحًا عَسَىٰ رَبُّكُمۡ أَن يُكَفِّرَ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ﴾[3].

واتـە: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هێنـاوە! بە گەڕانەوەیەکی ڕاسـت و سـاغ بگەڕێنەوە بۆ لای خوا، نزیکـە پەروەردگارتـان (لـە سـۆنگەی تۆبەیەکی ئەوتـۆوە) خراپەکانتـان لـێ بسڕێتەوە.

دیـارە وشـەی (عسـی) لـە کوردییدا لـە جێـی (ڕەنگـە)و (لەوانەیـە)و (نزیکە)یـەو لـە زمانـی عەرەبییشـدا بـۆ (تَرَجِّي وتطميع) بەکاردێ، بـەڵام بۆیـە لێرەدا مانـای مسـۆگەر بـوون (قطعيـة)ی لێخۆشـبوونی خـواو سـڕینەوەو، لابردنـی بـۆ گونـاح و خراپـەی بـۆ لای خـوا گـەڕاوەکان (التائبـون إلـى اللـه) دەگـەیـەنـێ، چونکـە خـوای

---

(١) بـۆ وێنـە: پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتـی: {مـن قـام رمضـان إيمـاناً واحتسـاباً غُفِـرَ لـه مـا تقـدَّم مـن ذنبـه...} أخرجه البخـاري: ٣٧، ومسـلم: ٧٥٩. ئاشـکراشـە کـە تەنیـا گوناحـە گچکـەکان بەهـۆی طاعـەت و کـردەوە چاکەکانـەوە دەسـڕێنەوە.

(٢) بـۆ وێنـە: خـوای باڵادەسـت فەرمویەتـی: ﴿أَمۡ حَسِبَ ٱلَّذِينَ يَعۡمَلُونَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن يَسۡبِقُونَاۚ سَآءَ مَا يَحۡكُمُونَ﴾العنكبوت:٤، ئاشـکرایە کـە لێرەدا (سـيئات) تەنیا گوناحە گچکـەکان نیـن.

(٣) التحريم: ٨.

پەروەردگار خاوەنی ئەوپەڕی بەخشندەییەو گوتراویشە: (مِـنْ عـادة الكريـم أنـه إذا أَطمَـعَ أعطـى) واتـە: عادەتی بەخشندە وایە، ئەگەر یەکێکی بە تەماو ئومێدەوار کرد، پێی دەبەخشێ.

دیـارە وشـەی (سـيئات)یش لێـرەدا، سـەرجەم جۆرەکانـی گونـاح بـە گـەورەو گچکەوە دەگرێتەوە، چونکە بە موتڵەقیی هاتووە، پاش تۆبەکردنی ڕاست و ساغ (التوبـة النصوح)یـش هاتـوە، کـە بێگومـان گوناحە زلـەکان زیاتـر حەوجێی تۆبـەی ڕاست و ساغن بۆ سڕانەوەیان، ئەگەرنا وردە گوناحەکان، تەنیا بەخۆپاراستن لە گوناحە زلـەکان و، بەبێ تۆبـەش دەسڕێنەوە.

﴿ إِن تَجْتَنِبُوا۟ كَبَآئِرَ مَا تُنْهَوْنَ عَنْهُ نُكَفِّرْ عَنكُمْ سَيِّـَٔاتِكُمْ وَنُدْخِلْكُم مُّدْخَلًا كَرِيمًا ﴾[1].

لـە کۆتایـی ئـەم باسـەش دەڵێیـن: ئاشـکرایە کـە بەشـێکی گـەورەی گوناحـە زلـەکان، بریتیـە لـە چواندنـی فـەرزەکان، کەواتـە: ئەنجـام دانـی فـەرزەکان، مەرجـە بـۆ سـڕینەوەی وردە گوناحـەکان



---

(١) النساء:٣١ .

**باسی دووەم: تۆبە ئەو گوناحانەش کە سزای دیارییکراویان بۆدانراوە، دەسڕێتەوە:**

هەرچەندە ئەوەی لە باسی پێشوودا هێنامان، بێ نیازمان دەکات لەم باسەو، دوو سێ باسی دیکەش کە دێن، بەڵام وەك (ذكر الخاص بعد العام) ویستم بۆ بەرچاو ڕوونیی زیاتر، پاش ڕاگەیاندنی ئەو ڕاستییە، کە تۆبەی ڕاست و ساغ، سەرجەم و تێکڕای گوناحەکان دەسڕێتەوە، لە چەند باسێکی سەربەخۆشدا سڕینەوەی تۆبە -بە لوتف و کەرەمی خوا- بۆ گوناح و تاوانەکان بخەینە ڕوو، بەهەر چوار جۆری:

١- سزای شەرعیی دیارییکراو بۆ دانراو.

٢- سزای شەرعیی دیارییکراو بۆ دانەنراو.

٣- گەورە.

٤- گچکە.

ئنجا ئێستا با سەرنج بدەین! داخۆ سڕینەوەو لابردنی تۆبەی ڕاست و ساغ، بۆ ئەو گوناح و تاوانانەی کە سزاو تۆڵەی شەرعیی دنیایی دیارییکراویان بۆ دانراوە، چۆن چۆنییە؟!

سەرەتا پێویستە بزانین کە ئەو گوناح و تاوانانەیە سزاو تۆڵەی شەرعیی دنیایی دیارییکراویان بۆ دانراوە، ئەم حەوتانەن:

١- لە ئایین هەڵگەڕاونەوە (الردة)، هەرچەندە زانایان مشت ومڕو ڕاجیاییان لەبارەی ئەسڵی سزایەکەوە هەیە.

٢- ڕێگریی (الحِرابة).

٣- کوشتنی بە ناحەق (القتل بغير الحق).

٤- داوێن پیسیی (الزنا واللِّواط).

٥- دزیی (السرقة).

٦- بوختانی داوێن پیسیی (القذف).

٧- خواردن و خواردنەوەی سەرخۆشكەر (أكل و شرب المسكر)، هەرچەندە لەبارەی چۆنیەتی سزایەكەیەوە ڕاجیایی هەیە.

بەڵام بە پەسەندی دەزانم بەر لەوەی چاو بە چۆنیەتی تۆبەكردن و گوناح لێ سڕانەوەی خاوەنەكانی، هەركام لەم حەوت جۆرە گوناحانەدا، بگێڕین، وەڵامی پرسیارێكی گرنگ بدەینەوە، كە سەرجەم ئەم حەوت گوناحە تێیدا بەشدارن و پەیوەندییان پێیەوە هەیە:

## ئایا سزاو تۆڵە شەرعییەكان، دەبنە مایەی سڕینەوەی گوناح و تاوانی خاوەنانی ئەو جۆرە گوناح و تاوانانە؟!

هەڵبەتە مەبەست لەم پرسیارە ئەوەیە، كە ئایا خاوەنی هەركام لەم گوناح و تاوانانە، ئەگەر هات و بێ ئەوەی تۆبە بكات، سزاو تۆڵەی شەرعیی بەسەردا جێبەجێ كرا، ئەو سزاو تۆڵەیە بە تەنها دەبێتە مایەی پاكبوونەوەی ئەو كەسەو سڕانەوەی گوناح و تاوانەكەی، یان نا؟!

شایانی باسە: زاناو پێشەوایان هەر لە زووەوە لەسەر ئەم مەسەلەیەو، وەڵامی ئەو پرسیارە، كێشەو مشت و مڕیان بووەو، بەگشتیی بوونەتە سێ دەستەوە:

١- دەستەیەكیان ڕایان وایە، كە بەڵێ سزای شەرعیی (الحد الشرعي) دەبێتە مایەی پاككردنەوەی خاوەنەكەی، با تۆبەشی نەكردبێ، (ابن حجر العسقلاني) ئەم ڕایەی پاڵداوەتە لای جەماوەری زانایان (جمهور العلماء)و گوتوویەتی: (إن إقامة الحد كفارة للذنب، ولو لم يتب المحدود، وهو قول الجمهور)[1].

---

(١) بڕوانە: (فتح الباري) ج١، ص ٦٨، و: (شرح صحيح مسلم) ج١١، ص ٢٢٤.

٢- دەستەیەکیشیان کە ئەمان کەمترن، ڕایان وایە کە سزاو تۆڵە شەرعییەکان، تەنیا سڵەمێنەرەوە (زواجر)ن و پاککەرەوە (جوابر) نین، بەڵکو ئەوەی کە ئینسان لە گوناح پاك دەکاتەوە، بەس تۆبەیە[1].

٣- دەستەیەکیشیان وەستان (توقف)یان لەم مەسەلەیەدا هەڵبژاردوە و، ئەم فەرموودەیەشیان کردۆتە دەستەگیرەی خۆیان: {عَن أبي هُرَيرة، قال: قال رَسُول اللهِ صلى الله عليه وسلم: ما أدري الحدود كفارة لأهلها أم لا؟}[2]، واتە: نازانم سزایەکان پاککەرەوەن بۆ خاوەنەکانیان، یان نا؟! واش پێدەچێ ڕای ڕاست کە هەموو دەقەکانیش لەسەری کۆدەبنەوە و پێکدێن و تێك ناگیرێن، ئەوە بێ کە بگوترێ: بابای مسوڵمانی گوناحکار، کە سزاو تۆڵەی شەرعیی بەسەردا جێبەجێ دەکرێ، دوو حاڵەتی هەن:

١- یەکێکیان ئەوەیە کە بە ڕەزامەندیی و بە پێی خۆی دێ و، داوا دەکات کە سزاو تۆڵەی شەرعیی بەسەردا بدرێ، ئنجا بێگومان بابای وا، ئەگەر وشەی تۆبەشی بەسەر زاردا نەیەت، سزاو تۆڵە شەرعییەکە، دەبێتە مایەی پاکبوونەوەو بگرە زۆر لە خوا نیزك بوونەوەیشی! وەك لە بەسەرهاتی (الغامدية)دا کە زینای کردبوو، پاش دان پێداهێنان، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی بەردباران (رجم)کرانی داو، پاشان لەبارەیەوە فەرمووی: {لَقَدْ تَابَتْ تَوْبَةً لَوْ قُسِمَتْ بَيْنَ أُمَّةٍ لَوَسِعَتْهُمْ}[3]، واتە: بە تەئکید تۆبەیەکی کردوە، ئەگەر بەسەر ئۆممەتێکدا دابەش کرابایە بەشی دەکردن.

٢- دووەمیشیان ئەوەیە کە بۆ خۆی نایەت و دەستگیر دەکرێ و، حەزیش نەکات سزای شەرعیی بەسەردا بدرێ، ئنجا بێگومان ئەمەیان سزاو تۆڵەی شەرعییەکەی بە تەنیا

---

(١) بڕوانە: (الأحكام السلطانية) للماوردي، ص (٢٧٥-٢٧٦)، و: (أحكام القرآن) لابن العربي، ج٢، ص٤١٢، و: (نيل الأوطار للشوكاني)، ج٩، ص٢٠٨.

(٢) أخرجه البزار برقم: ٨٥٤١، بإسنادين رجال أحدهما رجال الصحيح غير أحمد بن منصور الرمادي وهو ثقة، بڕوانە: (مجمع الزوائد) كتاب الحدود، باب: هل تكفر الحدود الذنوب أم لا؟ ج٦، ص٢٦٥.

(٣) أخرجه مسلم: ١٦٩٥، عن سليمان بن بريدة عن أبيه.

نابێتە مایەی پاکبوونەوەی لە گوناح و تاوانەکەی، مەگەر وێڕای ئەوە تۆبەش بکات، ئەگەرنا تەنیا لە ڕووی دنیاییەوە، سزای گوناحەکەی وەرگرتوەو لە دواڕۆژیشدا، ئەگەر خوا بە کەرەمی خۆی نەیبەخشێ، دووچاری سزاو جەزرەبە دەبێ، ئاخر هەر تەسلیم نەبوونی بە سزاو تۆڵەی شەرعیی، لە خۆیدا گوناح و تاوانێکی زلەو، پێویستیی بە سزاو تۆڵەی تایبەت هەیە، سەرەڕای گوناح و تاوانەکەیشی[1].

بەهێزترین بەڵگەی ئەم ڕایەش ئەم فەرموودەیەیە:

{عَـنْ عُبَـادَةَ بْـنِ الصَّامِـتِ رضي اللـه عنـه، وَكَانَ شَـهِدَ بَـدْرًا، وَهُـوَ أَحَـدُ النُّقَبَـاءِ لَيْلَـةَ الْعَقَبَـةِ: أَنَّ رَسُـولَ اللـهِ صلى اللـه عليـه وسـلم قَـالَ، وَحَوْلَـهُ عِصَابَـةٌ مِـنْ أَصْحَابِـهِ: بَايِعُـونِي عَـلَى أَنْ لاَ تُشْرِكُـوا بِاللـهِ شَـيْئًا وَلاَ تَسْرِقُـوا وَلاَ تَزْنُـوا وَلاَ تَقْتُلُـوا أَوْلاَدَكُـمْ وَلاَ تَأْتُـوا بِبُهْتَـانٍ تَفْتَرُونَـهُ بَـيْنَ أَيْدِيكُـمْ وَأَرْجُلِكُـمْ، وَلاَ تَعْصُـوا فِي مَعْـرُوفٍ، فَمَـنْ وَفَى مِنْكُـمْ فَأَجْـرُهُ عَـلَى اللـهِ، وَمَـنْ أَصَـابَ مِـنْ ذَلِـكَ شَـيْئًا فَعُوقِـبَ فِي الدُّنْيَـا فَهُـوَ كَفَّـارَةٌ لَـهُ، وَمَـنْ أَصَـابَ مِـن ذَلِـكَ شَـيْئًا ثُـمَّ سَـتَرَه اللـهُ، فَهُـوَ إِلَى اللـهِ، إِنْ شَـاءَ عَفَـا عَنْـهُ، وَإِنْ شَـاءَ عَاقَبَـهُ فَبَايَعْنَـاهُ عَـلَى ذَلِـكَ }[2].

واتـە: پێغەمبـەری (صلـى اللـه عليـه وسـلم) لـە حاڵێکـدا کـە کۆمەڵێـك لـە هاوەڵەکانـی لـە دەورە بـوون فەرمـووی: پەیمانـم لەگـەڵ ببەسـتن کـە هیـچ شـتێك نەکەنـە هاوبەشـی خـواو، دزیـی نەکـەن و زینـا نەکـەن و منداڵەکانتـان نەکـوژن و بوختانێـك لـە نێوان دەسـت و پێتانـدا، هەڵمەبەسـتن (واتـە تۆمەتـی زینـا بـۆ کـەس مەکـەن) و لـە چاکـەدا سـەرپێچیی مەکـەن، ئنجا هەرکەسێکتان ئەم پەیمانـە بەرێتـە سـەرێ، ئـەوە پاداشـتی لەسـەر خوایـەو هەرکەسێکیش شـتێك لـەو گوناحانـە بـکات و، لـە دنیـادا سـزا بدرێ، ئـەوە بـۆی دەبێتـە پاککـەرەوە، بـەڵام کەسـێك دووچـاری گوناحێـك لەوانـە ببـێ و خـواش بـۆی بپۆشـێ (و خەڵـك پێـی نەزانـێ و خـۆی نەیباتـە لای دادگا) ئـەوە سزادانەکەی دەگەڕێتـەوە بـۆ خوا (لـە قیامەتـدا)، ئنجا ئەگـەر ویسـتی لێـی دەبـوورێ و، ئەگـەر ویستیشـی سـزای دەدات، (عبـادة بـن الصامـت: دەڵـێ) ئنجا ئێمـەش لەسـەر ئـەوە پەیمانمـان دایـە.

---

(١) بڕوانە: (التوبة في ضوء القرآن الكريم)، ص٣٢٥.

(٢) أخرجه البخاري: ٣٦٧٩.

**تێبینی:** دیارە لێرەدا کە فەرموویەتی: (فعوقب في الدنيا) واتە: بەویست و ڕەزامەندیی خۆی، نەك بە تۆبزیی و دەستگیرکران.

ئنجا زانایـان بـۆ وەڵامـی ئـەو فەرموودیـەش، کـە وەسـتاوەکان (متوقفیـن) بـە بەڵگەیـان هێناوەتـەوە، گوتوویانـە:

**یەکەم:** هەرچەندە ئەو فەرموودیە ڕاستە، بەڵام ئەوەی (عبادة) ڕاست (صحیح) ترە.

**دووەم:** دەگونجێ فەرموودەی ناوبراو، بەرلەوە بووبێ کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ئاگادار بکرێتەوە، کە سزا شەرعییەکان (بەومەرجەی گوتمان) پاککەرەوەن.

ئێستاش بـا سـەرنجێکی خێرا لـەو حـەوت جۆرە گونـاح و تاوانـە بدەیـن، داخۆ تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ چییـان لـێ دەکات؟!

### ١- لە ئاییـن هەڵگەڕانەوە (الردة):

لـە لای زۆربـەی هـەرە زۆری نزیـك بـە یەکدەنگیـی (إجمـاع) زانایـان[1]، سـزاو تۆڵەی کافربوون و لـە ئیسـلام هەڵگەڕانـەوە (الإرتـداد عـن الإسلام) بریتیە لە کوشتن، بـە بەڵگـەی فەرمـوودەی پێغەمبـەر (صلـى اللـه علیـه وسـلم): {مَـنْ بـدَّلَ دِینـهُ،

---

(١) پاش لێکۆڵینەوەی زیاتر بۆم دەرکەوتوە کە سزای هەڵگەڕانەوە سزایەکی دیارییکراوی شەرعیی نیە، بەڵکو سزادانی هەڵگەڕاوان لەدەوڵەتی ئیسلامییدا، مەسەلەیەکە لەبازنەی سیاسەتی شەرعیی و صەلاحیەتی حوکمڕاندایەو، هیچ بەڵگەیەك لەسەر ئەوە نیە کە مرۆڤ لەسەر خودی هەڵگەڕانەوە بکوژرێ، مەگەر حاڵەتی دژایەتیی کردن و سەنگەر گرتنی بچێتە پاڵ و، من لەو زنجیرە وتارەی کە بە ناوونیشانی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی) لەکەناڵی ئاسمانیی (پەیام)و لەبەرنامەی (سەرنج)دا پێشکەش دەکرێن، لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلم لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە کردوە، کە دواتر بەشێوەی کتێبیش بڵاودەکرێتەوە خوا یاربێ.
دوایی وەك نامیلکەیەکی سەربەخۆ چاپ کراو، لەنێو (مەوسووعەی: ئیسلام و دەوڵەتداریی )یش دا چاپ کرا.

فَاقْتُلُوهُ}[١] ، واتە: هەر كەسێك (لە مسوڵمانان) ئایینی خۆی گۆڕی، بیكوژن، بەڵام بێگومان پاش داوای گەڕانەوە لێكردنی (بعد إستتابتة)ی، كە زۆربەی زانایان ئەو داوای تۆبە لێكردنە، بە فەرزو بەشێكیشیان بە پەسەندی دەزانن[٢].

شایانی باسیشە كە بابای هەڵگەڕاوە (مرتد) كردەوە، چاكەكانی هەڵدەوەشێنەوە، وەك خوای باڵادەست فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَكْفُرْ بِٱلْإِيمَٰنِ فَقَدْ حَبِطَ عَمَلُهُۥ وَهُوَ فِى ٱلْءَاخِرَةِ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴾[٣].

هەروەها هاوسەرەكەی لێی جیا دەبێتەوە و، نەمیراتی لێ دەگیرێ و، نە میراتیش لەكەس دەگرێ و، ماڵ و سامانەكەیشی بە (فَيْء) دادەنرێ و، دەخرێتە خەزێنەی مسوڵمانان (بیت مال المسلمین)ەوە[٤].

بەڵام ئەگەر تۆبەی كرد، ئەوە ئەو شتانە هیچیان نامێنن و دەچێتەوە سەر دۆخی جاران، هەرچەندە هەندێك لە زانایانیش گوتوویانە: پێویستە خواپەرستییەكان (عبادات)ی بگێڕێتەوە[٥]، بەڵام بێگومان ڕای ئەوانە بەهێزترە كە گوتوویانە[٦]: نایانگێڕێتەوە، چونكە هەر بەشێوەی كاتیی (مؤقت) هەڵوەشابوونەوە، یان ڕاستتر بڵێین: هەڵوەشاندنەوە (حبوط)ی كردەوەكانی هەڵواسراو (مُعَلَّق) بووەو، بە مردنی لەسەر كوفرەوە، مادام لەسەر كوفر نەمردوە، هەڵنەوەشاونەوە.

---

(١) أخرجه البخاري: ٢٨٥٤.

(٢) شافیعییەكان و مالیكییەكان و(أحمد) لە قسەیەكیدا بە فەرزو (أبو حنیفة) بە پەسەندی دەزانێ، بڕوانە: (التوبة في ضوء القرآن الكریم)، ص(٣٦٩-٣٧٣).

(٣) المائدة :٥.

(٤) بڕوانە: (أحكام القرآن) ج١، ص ١٤٩، و: (الجامع الأحكام) ج٦، ص (١٦٠-١٦١)، و (المغني) ج٨، ص(١٢٨-١٣٠).

(٥) ئەمە ڕای (أحمد)ە، لە یەكێك لە دوو قسەكانیدا، بڕوانە: (التوبة في ضوء القرآن الكریم)، ص ٣٢٨.

(٦) كە ڕای (شافعي وأحمد)یشە لە قسەیەكی دیكەیدا، سەرچاوەی پێشوو، ص(٣٨٢-٣٨٣).

ئنجا هەرچەندە ئایەتی ژمارە (٥)ی (المائدة) بە موتڵەقیی هەڵوەشانەوەی کردەوەکانی بابای هەڵگەڕاوە، دەگەیەنێ:

﴿وَمَن يَكۡفُرۡ بِٱلۡإِيمَٰنِ فَقَدۡ حَبِطَ عَمَلُهُۥ﴾.

بەڵام ئایەتی ژمارە (٢١٧)ی (البقرة) مەرجدار و بەنددار (مشروط و مقيد) ی کردوە بە مردنەوە لەسەر کوفر:

﴿وَمَن يَرۡتَدِدۡ مِنكُمۡ عَن دِينِهِۦ فَيَمُتۡ وَهُوَ كَافِرٞ فَأُوْلَٰٓئِكَ حَبِطَتۡ أَعۡمَٰلُهُمۡ فِي ٱلدُّنۡيَا وَٱلۡأٓخِرَةِۖ﴾.

واتە: هەر کامێکتان لە ئایینەکەی هەڵگەڕێتەوەو بە کافریی بمرێ، ئەوانە کردەوەکانیان لە دنیاو دوارۆژدا هەڵوەشانەوە، ئنجا بێگومان بنچینەیەکی (أصول الفقه) نێوان زانایانە کە: (يُحْمَلُ المُطْلَقُ على المقيَّد)، واتە: ئەگەر لەبارەی مەسەلەیەکەوە، دوو دەق (نص)ی ڕەهاو بەنددار (مطلق و مُقيّد) هەبوون، پێویستە بەند (قید)ی سەر بەنددارەکە، ڕەچاو بکرێ و کاری پێبکرێ.

هەروەها تێکڕای زانایان ڕایان وایە، کە هاوسەرو خێزانەکەیشی دەگەڕێتەوە لای و، پێویستی بە مارەکردن (عقد)ەوەی تازەش ناکات[1].

زۆربەشیان دەڵێن: ماڵ و سامانەکەیشی دەگەڕێتەوە لای[2].

**تێبینیی:** ئەوەی نووسراوە ڕای زۆربەی زانایانە لەوبارەوە، بەڵام من ڕایەکی دیکەم پێ ڕاستترە، کە لە مەوسووعەی: (ئیسلام و دەوڵەتداریی) کتێبی دووەم: (بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی ئیسلامیی)دا هێناومە و، کورتەکەی ئەوەیە کە بابای هەڵگەڕاوە سزای کوشتنی لەسەر نیە، مەگەر وێڕای هەڵگەڕانەوەکەی لە دژی ئیسلام و مسوڵمانانیش بجەنگێ و، ئەوکاتەش لەسەر دژایەتیی و جەنگکردنەکەی دەکوژرێ.

---

(١) بڕوانە: (التوبة في ضوء القرآن الكريم)، ص(٣٨٣-٣٨٤).

(٢) (ابن قدامة) لە (المغني)دا گوتوویەتی: (ولا يحكم بزوال ملك المرتد بمجرد ردته عند أكثر أهل العلم...وإن راجع الإسلام، فملكه باق له) ج٣، ص١٩١.

٢- ڕێگریی (الحـــرابة):

ڕێگریی کە لە کتێبە فیقهییەکاندا، هەم وشەی (الحرابـة)و هەم وشەی (قطع الطريق)یش بۆ بەکارهاتوە، سزایەکەی ئەوەیە کە لە ئایەتی ژمارە (٣٣)ی (المائـدة)دا دیارییکـراوە:

﴿ إِنَّمَا جَزَٰٓؤُاْ ٱلَّذِينَ يُحَارِبُونَ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ وَيَسۡعَوۡنَ فِي ٱلۡأَرۡضِ فَسَادًا أَن يُقَتَّلُوٓاْ أَوۡ يُصَلَّبُوٓاْ أَوۡ تُقَطَّعَ أَيۡدِيهِمۡ وَأَرۡجُلُهُم مِّنۡ خِلَٰفٍ أَوۡ يُنفَوۡاْ مِنَ ٱلۡأَرۡضِۚ ... ﴾.

واتە: بێگومان سزای ئەو کەسانە کە دژایەتیی خواو پێغەمبەرەکەی دەکەن و خراپە لە زەویدا دەکەن، هەر ئەوەیە کە: بکوژرێن، یان هەڵبواسرێن، یان دەست و پێیان پێچەوانە (دەستی ڕاست و پێی چەپ) ببڕێن، یان لە وڵات دوور بخرێنەوە.

ئنجا خەڵکی ڕێگرو ئاشووبگێڕ، ئەگەر پاش دەستگیرکردن تۆبە بکەن، ئەوە مەگەر بۆ قیامەت، دەنا بۆ دنیا هیچ دادیان نادات، بەڵام ئەگەر بەر لە دەستگیرکرانیان تۆبە بکەن، ئەوە ڕای بەهێزتر ئەوەیە کە هەرچی مافی خوا (حق الله)یە لەسەریان، لا دەچێ، هەر لە سزای ڕێگرییەکەوە بگرە هەتا هەر گوناح و تاوانێکی دیکە، وەك مەیخۆریی و زیناو ...هتد[١]، چونکە خوای دادگەرو بەخشەر فەرموویەتی:

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِن قَبۡلِ أَن تَقۡدِرُواْ عَلَيۡهِمۡۖ فَٱعۡلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾[٢].

واتە: (ئەوەی لە ئایەتی پێشوودا گوترا سزای ڕێگرانە) بێجگە لەوکەسانەی کە بەرلەوەی بیانخەنە ژێر ڕکێفتانەوە، تۆبە دەکەن، ئەوە خوا (بۆ ئەوان) لێبوردەو بە بەزەییە.

---

(١) بڕوانە: (المجموع شرح المهذب) للنووي، ج٢، ص١٠٧، و (المغني) لابن قدامة، ج٨، ص٢٩٥.

(٢) المائدة: ٣٤.

### ٣- کوشتنی بە نـــاهــەق:

لێرەدا مەبەستمان لە کوشتنی بەناحەق، جۆری بە ئانقەست (العمد)ە، چونکە سزای کوشتن، وێڕای کوشتنەوەی بە هەق، کە تۆڵە (قصاص)ی پێدەڵێن: سێ جۆرە[1]:

أ- کوشتنی بە ئانقەست (القَتْلُ العَمْد) کە وەك شەرعزانان پێناسەیان کردوە، ئەوەیە کەسێك بە ناهەق و ستەم و، بە ئاگا لێ بوون و زانیارییەوە، بەشتێك لە کەسێك بدات، کە بە زۆریی ئینسان دەکوژێ: (قصد من يَعْلَمهُ معصوماً بما يَقْتُل غالباً).

ب- کوشتنی هەڵەی بە ئانقەست چووێنراو (القتل الخطأ شِبْهُ العَمْد) ئەمیش بریتیە لەوەی کەسێك بە ناهەق و ستەم و بە زانیاریی پێ بوونەوە بە شتێك (وەك قەمچی، گۆچان، زللە) لە کەسێك بدات و بیکوژێ، کە ئەو شێوە لێدان و ئەو شتە، بە دەگمەن نەبێ، خەڵکی پێ نەمرێ (قصد من يعلمه معصوماً بما لايقتل غالباً).

ج- کوشتنی هەڵەی ڕووت (القتل الخطأ المحض) کە ئەمیش دوو جۆرە:

**یەك:** هەڵە لە کردەوەدا (الخطأ في الفعل) کە بریتیە لەوەی بۆ وێنە: تفەنگ لە نیشانەیەك بگرێ، بەڵام بێئەوەی پێی بزانێ، بە کەسێك بکەوێ و بیکوژێ.

**دوو:** هەڵە لە مەبەستدا (الخطأ في القصد) بۆ وێنە: تفەنگێك بگرێتە کەسێك کە پێی وایە دوژمنەو خوێنی حەڵاڵە، پاشان دەربکەوێ کە مسوڵمان و دۆستەو کوشتنی ڕەوا نیە، ئنجا دیارە هەرچی جۆری هەڵە (خطأ)یە بە هەردووك شێوەکەیەوە، گوناحی قیامەت و، تۆڵەی دنیایی نیە، بەڵام خوێن (دية)و سڕینەوە (كفارة)ی هەیە، بەڵام جۆری بە ئانقەست چوو (شبه العمد) وێڕای خوێن و کەففارەتی دنیا، گوناحباریی قیامەتیشی بەدواوەیە، جۆری سێیەمیش (العمد المحض) ئەمیش سزا دنیاییەکەی، بریتیە لە سەرپشك (مختار)کرانی خوێن ئەستێنی کوژراو، لە نێوان

---

(١) بڕوانە: (مـجموع الفتاوى)ی (ابن تيمية)، ج ٢٨، ص٢٠٦، و: ج٢٠، ص (٢٠٩-٢١٠)، و: ج٢٠، ص (١٥-١٨).

کوشتنەوە (قصاص) و، خوێن وەرگرتن (دیة) و، لێبوردن (عفو)دا، وەك خوای دادگەر فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ فِي ٱلۡقَتۡلَىۖ ٱلۡحُرُّ بِٱلۡحُرِّ وَٱلۡعَبۡدُ بِٱلۡعَبۡدِ وَٱلۡأُنثَىٰ بِٱلۡأُنثَىٰۚ فَمَنۡ عُفِيَ لَهُۥ مِنۡ أَخِيهِ شَيۡءٞ فَٱتِّبَاعُۢ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَأَدَآءٌ إِلَيۡهِ بِإِحۡسَٰنٖۗ ذَٰلِكَ تَخۡفِيفٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَرَحۡمَةٞۗ ﴾[1].

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! تۆڵە ستاندنەوەتان لە کوژراواندا لەسەر پێویست کراوە، ئازاد بە ئازادو، کۆیلە بە کۆیلەو، مێینە بە مێینە، ئنجا هەرکەسێك لە براکەیەوە لە شتێك بەخشرا (لە کوشتنەوە یان لە بەشێکی خوێن) ئەوە با خاوەن حەق بە چاکیی شوێن هەقی خۆی بکەوێ و، بابای خوێندەریش بە لەبارییی تەسلیمی بکات، ئەوە سووککردن و بەزەیی نواندنێکە لە پەروەردگارتانەوە.

ئنجا هەرکاتێك قەتڵی ئانقەست تۆبەی لێکرا، ئەوە بابای کوژەر (قاتل) چ دوایی تۆڵەی لێوەربگیرێ، چ خوێن بدات، یان ببەخشرێ، بەڕای زۆربەی هەرەزۆری زانایان، مادام تۆبەکەی ڕاست و ساغ بێ، خوا لە هەقی خۆی دەیبەخشێ و پاکی دەکاتەوە.[2] ئەوانەش کە ڕایان وایە کوژەری ئانقەست (قاتل العمد) ڕێی تۆبەکردنی نیە، بەڵگەیەکی وایان بەدەستەوە نیە، بە پێچەوانەی جەماوەری زانایانەوە، کە چەندان بەڵگەی قورئان و سوننەتیان بە دەستەوەن و[3]، تەنیا ئەم بەڵگەیەش بەسە کە: مادام بابای کافر بۆی هەبێ تۆبە بکات و لێی وەربگیرێ، بۆچی کوژەر بۆی نیە، خۆ هەر چۆن بێ، کوفر لە کوشتن (قتل) گەورەترە؟!

---

(١) البقرة:١٧٨.

(٢) بڕوانە: (فتح الباري) ج٨، ص ٤٨٩٦، و: (تفسير ابن كثير) ج١، ص ٥٣٧.

(٣) بڕوانە: (الفتاوى الكبرى) لابن تيمية، ج٤، ص ٤٣١، و: (مدارج السالكين) ج١، ص ٣٩٩.

### ٤- داوێـن پیسـیی:

مەبەستمان لە داوێن پیسیی هەم زیناو هەم نێربازیی (لواطة)شە، چونکە لە لای زۆرێك لە زانایان حوکمی نێربازییش، ئەگەر لە هی زینا توندتر نەبێ کەمتر نیە،[1] دیارە حوکمی زیناو سزای بابای زیناکەر (زاني)یش ئەگەر کوڕو کچ بن، سەد (١٠٠) قەمچیی و، ساڵێك دوور خستنەوە[2](نَفي)یەو، ئەگەر ئافرەتی مێردکردوو و پیاوی ژن هێناویش بن، کە بە (محصن) ناو دەبرێن، سزایەکەیان بەردباران (رجم) کردنە هەتا مردن.

ئنجا هەرچی سزای (زاني و زانية)ی کوڕو کچە، ئەوە لە قورئاندا هاتوە:

﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِى فَٱجْلِدُوا۟ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِا۟ئَةَ جَلْدَةٍ﴾[3].

بەڵام سزای ژن و پیاو (الثيب)، ئەوە لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، {هەرچەندە هەندێك لە زانایان مشت ومڕو ڕاجیاییان لەوبارەوە هەیەو منیش پاش لێکۆڵینەوەی زۆر، ڕای دیکەم هەیە کە ئێرە گونجاو نیە بۆ خستنە ڕووی، بەڵام لە تەفسیری سووڕەتی (النور)دا، قسەی تەواوی خۆمم لەوبارەوە کردوە}، بۆ وێنە: {الثَّيِّبُ بِالثَّيِّبِ جَلْدُ مِائَةٍ وَرَمْيٌ بِالْحِجَارَةِ}[4]، واتە: پیاوی

(١) بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج٢، ص (٧٨٣-٧٩١)، کە ڕای زانایان و مەزهەبەکانی بە وردیی هێناوە، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی نێربازییەوە فەرموودەی زۆرن، ئەمە یەکێکیانە: (ومن وجدتموه يعمل عمل قوم لوط فاقتلوا الفاعل والمفعول به) رواه أبو داود والترمذي وابن ماجه وصححه الألباني في (الإرواء) ٢٣٥٠. تێبینیی: لەبارەی سزای نێربازییشەوە لە تەفسیری سووڕەتی (هود)دا، لەکاتی باسکردنی بەسەرهاتی (لوط) وگەلەکەیدا، قسەی دیکەم کردوە، پێم وایە سزایەکە ئازاردان وتەمبێ کردنە نەك کوشتن، کوشتنی بابای نێرباز ونێربازیی لەگەڵ کراو، بەڵگەیەکی بەهێزی لەسەر نیە.

(٢) (أبو حنيفة) دوورخستنەوە بە (منسوخ) دەزانێ، بەڵام زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە نەسخ نەکراوەتەوە، بڕوانە: (الزواجر..) ج٢، ص ٧٦٩.

(٣) النور :٢.

(٤) أخرجه أحمد: ٢٢٧١٨، ومسلم: ١٤٣٩، وأبو داود: ٤٤١٥، والترمذي: ١٤٣٤، وابن

هاوسەردار و ژنی شووکردوو، یەکی سەد قامچیی و بەردبارانکردن، سزایانە، بەڵام وەك (ابـن حجـر الهیتمـي) گوتوویەتـی: (وعامـة العلـماء عـلى أن الجلـد يدخـل في الرجـم)[1] زانایـان بەگشـتیی ڕایـان وایـە کـە قەمچیـی لێدان، چۆتـە نێـو بەردبارانـەوە، بـە بەڵگـەی ئـەوە کـە پێغەمبـەر (صلـى اللـه عليـه وسـلم) (ماعـز و غامديـة)ی بەردباران کـردن و قەمچیی لـێ نـەدان، جـا لەبـارەی تۆبەکردنـی زیناکـەرەوە، ئەگـەر تاوانەکـە هـەر لـە نێـوان خـۆی و خوادابـێ و خەڵـك پێـی نەزانیبـێ، ئـەوە سـزا (حـدّ)ی لەسـەر پێویسـت نیـەو، تۆبـەش پاکـی دەکاتـەوە[2]. بـەڵام پـاش ئاشـکرابوون و ئیسـپات بوونـی تاوانەکـە، ئـەوە بـەڕای زۆربـەی زانایـان هەرچەنـدە تۆبـەش بـکات، سـزایەکەی لەسـەر لاناچـێ[3]، بـەڵام مـادام بەڕاسـتیی تۆبـەی کردبـێ، یـان خـۆی دانـی بـە تاوانەکـەدا هێنابـێ، ئـەوە گوناحەکـەی لـێ دەسڕێتـەوە[4].

### ٥- سـزای دزیـی:

سزای دزیـی مـادام مەرجـە شـەرعییەکانی هاتبنـە دی، بریتیـە لـە بڕینـی دەسـتی ڕاسـتی بابـای دز (سـارق) لـە مەچەکییـەوە[5]، وەك خـوای باڵادەسـت فەموویەتـی:

﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا جَزَآءَۢ بِمَا كَسَبَا نَكَٰلٗا مِّنَ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٞ ﴾[6].

---

ماجه: ٢٥٥٠، وابن حبان: ٤٤٢٥.

(١) سەرچاوەی پێشوو، ج٢ ص٧٦٩.

(٢) بڕوانە: (الام) للشافعي، ج١، ص ١٣٨، و: (سبل السلام شرح بلوغ المرام) للصنعاني، ج٤، ص٥.

(٣) (إبن العابدين) گوتوویەتی: (أجمع العلماء على أن التوبة لا تسقط الحد في الدنيا، أي الحد الثابت عند الحاكم بعد الرفع اليه)، بڕوانە: (حاشية إبن العابدين) ج٤، ص٤.

(٤) بڕوانە: (جامع البيان) للطبري، ج٢٤، ص ١٢، تفسير آية الزمر: ٥٣.

(٥) مەچەکی دەست: بازنەی دەست، جومگەی دەست (الرسغ).

(٦) المائدة: ٣٨.

واتـه: دەستی دزی پیاو و ئافرەت ببـڕن، سزای کردەوەیان و تەمبێ کردنه لـه خواوەو خوا زاڵی کاربەجێیە.

دەربارەی کاریگەریی تۆبـه بـۆ لابردنـی سـزای دزیـی، ئـەوە زۆربـەی زانایـان دەڵێـن: کـه پێش بەرزکردنـەوە بـۆ لای دەسـتەڵاتی شـەرعیی و، تێکڕاشـیان دەڵێـن: دوای ئـەوەی پێـی ڕادەگەیەنـرێ، هیـچ لـه حوکمەکـەی ناگـۆڕێ، ئەوەنـدە هەیـه بەرلـەوەی بگەیەنرێتـە دادگا، بابای شت لـێ دزراو (المسروق منـه) ئەگـەر بابای دز عەفـوو بـکات، زانایان یەکدەنگـن کـه سـزای شـەرعیی دنیایـی نـادرێ[١]، بـەڵام زۆربـەی هـەرە زۆریـان ڕایـان وایـه کـه پـاش گەیشـتن بـه دەسـەڵاتی شـەرعیی، لێخۆشـبوونی بابـای خـاوەن مـاڵ، هیـچ لـه مەسـەلەکە ناگـۆڕێ[٢]، بـەڵام (أبـو حنیفـة) ڕای وایـه ئەوکاتـەش هـەر سـزای شـەرعیی بەسـەردا نـادرێ[٣]، بـەڵام بـۆ گوناحـی دزییەکـە، ئـەوە بێگومـان تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ پێـش و پـاش سزادانەکەش نایهێڵـێ و، خاوەنەکـەی پـاك دەکاتـەوە[٤]، چونکـه خـوا فەرموویەتـی:

﴿ فَمَن تَابَ مِنۢ بَعۡدِ ظُلۡمِهِۦ وَأَصۡلَحَ فَإِنَّ ٱللَّهَ يَتُوبُ عَلَيۡهِۚ إِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٌ ﴾[٥].

واتـە: جـا هەرکەسـێك پـاش سـتەمکردنەکەی (کـه دزییـه) تۆبـه بـکات و چاکەکاریـی بـکات، ئـەوە مسـۆگەر خـوا دەگەڕێتـەوە سـەری (بـه لێبوردنـەوە) بێگومـان خـوا لێبـوردەی بـه بەزەییـه.

---

(١) بڕوانـه: (بدايـة المجتهـد)لابن رشـد، ج٢، ص ٣٣٩، و: (الفقـه علـى المـذاهب الأربعـة)، ج٥، ص ١٢٩.

(٢) بڕوانه: (المغني) لابن قدامه، ج٨، ص٢٩٦، و: (رد المحتار على الدر المختار)، ج٣، ص ١٤٠، و: (نهاية المحتاج)، ج٨، ص٨.

(٣) بڕوانه: (بدائع الصنائع) للكاساني الحنفي، ج٧، ص (٨٨-٨٩)، و: (المغني) ج٨، ص ٢٩٦.

(٤) بەڵام یەکێك لە مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ، وەك پێشتر گوتوومانە: گێڕانەوەی ماڵە دزراوەکەیە، یان گەردنی خۆ پێ ئازادکردنی خاوەن ماڵ.

(٥) المائدة:٣٩.

دیـارە کاتێـك خـوای کاربەجـێ پـاش تۆبەکردنـی بابـای (دز) خـۆی بـە: تۆبـە وەرگـر (یتـوب علیـە) و لێبـوردە (غفـور) و بـە بەزەیـی (رحیـم) وەسـف دەکات، مەبەستی ئەوەیـە کـە بەو سیفەتە بەرزانەی مامەڵەی لەگەڵ دەکات و، کەسێکیش خـوا: تۆبـەی لـێ وەبگـرێ و، لێـی ببـوورێ و، بەزەیـی پێیـدا بێتـەوە، دیـارە لـە گوناحەکـەی پـاك بۆتـەوە! بەڕاسـتیی منیـش ئـەم ڕایـەم لـەلا بەهێـزو پەسـندە.

## ٦- بوختـانی داوێـن پیسـیي (القـذف):

ئەم تاوانەش سزایەکەی هەشتا (٨٠) قەمچییە، وەك خوای دادگەر فەرمووویەتی:

﴿ وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ وَلَا تَقۡبَلُواْ لَهُمۡ شَهَٰدَةً أَبَدٗاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡفَٰسِقُونَ ﴾[1].

واتـە: ئـەو کەسـانەی کـە بوختـان بـۆ ئافرەتانـی داوێـن پـاك دەکـەن، پاشـان چـوار شـایەدان ناهێنـن (بـۆ ئیسـپاتی قسـەکەیان) (سـزایان ئەوەیـە) پێویسـتە هەشـتا قەمچییـان لـێ بدەن و، هەرگیـز شـایەدییان لـێ وەرمەگـرن و، ئەوانـەن لاڕێ بـووان.

دەربـارەی کاریگەریـی تۆبـەش بـۆ لابردنـی سـزاو گوناحـی بوختـان کـردن، بـە کورتیـی دەڵێیـن: لـە سـۆنگەی ئـەوەوە کـە سـزای بوختـان (حـد القذف)یـش وەك هەرکام لـە سـزای کوشـتن و زینـاو دزیـی، هـەم هەقـی خـوا (حق اللە)و هـەم هەقـی ئادەمـزاد (حـق الآدمي)یشـە، بـەر لـەوەی پێـی بزانـرێ و ببرێتـە لای دادوەری شـەرع (حاکـم الـشرع)، ئـەوە تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ دەبێتـە هـۆی لابردنـی، بـەڵام پـاش گەیاندنـی بـە دەسـەڵاتی شـەرعیی (السـلطة الشرعیـة) دەبـێ حەتمـەن جێبەجـێ بکـرێ و، زانایـان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن[2].

---

(١) النور: ٤.

(٢) (ابـن رشـد) گوتوویەتـی: (واتُّفِـقَ عـلى أن التوبـة لا ترفـع الحـد) (بدایة المجتهد) ج٢، ص ٣٣٢، هەروەهـا (ابـن قدامـة) گوتوویەتـی: (فـإن تـاب لم یسـقط الحـد..)، بڕوانـە: (المغنـي) ج٩، ص ١٩٨.

بەڵام بۆ گوناحەکەی، ئەوە بەهۆی تۆبەی ڕاست و ساغەوە، وەك هەر گوناحێکی دیکە خوا دەیسـڕێتەوە، چونکە خوای بەخشـنده فەرموویەتی:

﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴾[1].

واتـە: (لێدانـی هەشـتا قامچیـی سـزای بوختانچییانـە وێـڕای شـایەتیی لـێ وەرنەگیـران و بـە فاسق دانـران).. بێجگـە لـەو کەسانەی کـە پـاش ئـەوە (واتـە پـاش هەشتا قامچیی لێدانەکە) تۆبـە دەکـەن و چاکەکاریی دەکـەن، ئـەوە بێگومـان خوا لەگـەڵیـان لێبـوردەی بـە بەزەییـە[2].

بـەڵام ئایا حوکمی (شایەتیی لـێ وەرنەگیران)یـش وێـڕای لاچوونی گونـاح و سـزاو جەربـەزەی دواڕۆژ، لادەچـێ، یـان نـا؟! زانایـان ڕاجیاییـان هەیـە:

هەرچـی زۆربەیانـن کـە لـە هـاوەڵان: (عمـر بـن الخطـاب وعبدالله بـن عبـاس) خـوا لێیـان ڕازیبـێ و، لـە شـوێن کەوتـووان (تابعیـن): (عطـاء وطـاووس ومجاهـد والشعبـي الزهـري)و، لـە پێشـەوا سـەرمەزهەبەکان (مالـك و شـافعي[3]و أحمد)یـان، خـوا لێیـان خۆشبێ، لەنێودان، ڕایـان وایـە کـە: بەڵـێ مـادام تۆبەیەکـی ڕاسـت و سـاغ بـکات و مەرجەکانـی (کـە یەکیـان چاکەکارییـە) تێدا بێنـەدی، ئـەوە سـزای شـایەتیی لـێ وەرنەگیرانیشـی، وەك گوناحباریـی قیامـەت، کـە بـە (فِسق) تەعبیر کـراوە، لادەچـێ[4].

---

(١) النور :٥.

(٢) (ابن قدامة) گوتوویەتی: (فـإن تاب لـم يسـقط الـحَدُّ، وزال الفسـق بلا خـلاف) بڕوانە: (المغني) ج٩، ص ١٩٨.

(٣) خاوەنـی (التوبـة فـي ضـوء القرآن الكريـم) بـە هەڵـە، یـان هەڵـەی چاپـی، لـە جیاتـی (شـافعي) (أبـو حنيفـة)ی نووسـیوە، کـە بێگومـان هەڵەیـە، بڕوانـە: ص٤٣٢.

(٤) بڕوانـە: (المغنـي) ج٩، ص ١٩٧، و: (أحـكام القرآن) لابـن العربـي، ج٣، ص ٢٧١، و: (الفقـه علـى المذاهـب الأربعـة) ج٥، ص ٢٤١.

بەڵام هەندێکیان کە (أبو حنيفة) یان لە نێودایە، خوا لێی خۆش بێ، ڕایان وایە کە گوناهباریی قیامەتیان- پاش تۆبە- نامێنێ، بەڵام بە شایەد نەشیان مۆرێکەو هەتا ماون لە نێو چاوانیان نابێتەوە![1]

بەڵام بێگومان ڕای زۆربەی زانایان ڕاستترو بەڵگەدارترە، کە دەتوانین ئاماژە بە سێ لە بەڵگەکانیان بکەین:

**یەکەم:** دەڵێن: ئەو هەڵاواردن (إستثناء)ی کە بەدوای: ﴿ وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَـٰدَةً أَبَدًا ۚ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾[2]، دا هاتوە، کە بریتیە لە: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُوا۟ مِنۢ بَعْدِ ذَٰلِكَ وَأَصْلَحُوا۟ فَإِنَّ ٱللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[3]، پێویستە هەردووک ڕستەی: ﴿ وَلَا تَقْبَلُوا۟ لَهُمْ شَهَـٰدَةً أَبَدًا ۚ ﴾ و ﴿ وَأُو۟لَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلْفَـٰسِقُونَ ﴾ بگرێتەوە، چونکە یەکسەر بە دوایاندا باس کراوە، (فخرالدين الرازي) لەوبارەوە گوتوویەتی[4]:

(لو قال شخص: إن عبده حر وأمرته طالق إن شاء الله، فيرجع الإستثناء إلى الجميع) واتە: ئەگەر کەسێك بڵێ: کۆیلەکەی ئازادو ژنەکەی تەڵاقی کەوتبێ، ئەگەر خوا بیەوێ، ئەوە (إن شاء الله)یەکە بۆ هەموویان دەچێتەوە.

لە ڕاستییدا ڕستەی (وأولئك هم الفاسقون) ڕستەیەکی سەربەخۆ نیەو، بەڵگە هێنانەوە (تعليل)ێکە بۆ هۆی ڕەدکردنەوەی شایەتییدانی بوختانکەران، واتە: مادام فاسقن بە شایەدیان مەگرن، کەواتە: هەرکاتێك (فاسق) نەمان شایەتییان لێ وەردەگیرێ، هەر بۆیەش (الشعبي) بەو کەسانەی گوتوە کە ڕایان وابووە هەرگیز بوختان کەر بە شایەد ناشێ: (يقبل الله توبَتَهُ ولا تقبلون شهادته!)، واتە: خوا تۆبەی لێوەرگرتوون و، ئێوە شایەدییان لێوەرناگرن!

---

(١) بڕوانە: (بدائع الصنائع للكاساني)، ج٧، ص ٦٣.

(٢) النور :٤.

(٣) النور :٥.

(٤) بڕوانە: (مفاتيح الغيب) کە بە (التفسير الكبير) ناسراوە، ج٢٣، ص ١٦١.

ئنجا ئـەوە کـە هەندێکیـان وشـەی (أبـداً) هەرگیـز، بـە بەڵگـە دێننـەوە، وەڵامەکـەی ئەوەیـە کـە خـوای دادگـەر مەبەسـتی ئەوەیـە کـە: هەتـا بوختانچیـی بێ (مـادام قاذفـاً)، بـەڵام کـە تۆبـەی کـرد، دیـارە ئـەو خەسـڵەتەی نامێنـێ و، ئـەو (هەرگیز)ەشـی لـە کـۆڵ دەبێتـەوە[1].

**دووەم:** بابای کافر ئەگەر دەیان بوختانیشی کردبن دوای مسوڵمانبوونی، بە یەکدەنگیی زانایان شایەدیی لێ وەردەگیرێ، چونکە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی[2]: ((یاعمرو! أما علمت أن الإِسلام یهدم ماکان قَبْلَهُ؟!..))[3] ، واتە: ئەی عەمر! ئایا نازانی کە ئیسلام (گوناحەکانی) پێش خۆی ناهێڵێ؟.

دەجا بێگومـان مسـوڵمان شایسـتە تـرە کـە کـە بەهـۆی تۆبـەوە لـە هەمـوو شـتێك پـاك بێتـەوەو، وەك جارانـی لـێ بێتـەوەو، شـایەدیی لـێ وەربگیـرێ، بـە تایبەتیـش کـە پێغەمبـەر (صلـی اللـه علیـه وسـلم) فەرموویەتـی: {التَّائِـبُ مِـنْ الذَّنْـبِ كَمَـنْ لَا ذَنْـبَ لَـهُ}[4]، واتـە: تۆبـە کـردوو لـە گونـاح، وەك کەسـێکە کـە هـەر گوناحـی نەبـێ.

**سێیەم:** زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوە کە بابای کافرو کوژەرو داوێن پیس و... هتد، هەرکاتێك تۆبەیان کرد، شایەدیی (شهادة) یان لێوەردەگیرێ، دەجا بوختانەکەیش هەروایە، چونکە بوختان (قذف) لە قەتڵ و زینا گەورەتر نیە![5]

ئنجـا هەرچەنـدە لـە چـاو تاوانەکانـی دیکـە، زۆر لەسـەر بوختـان ڕۆیشـتین، بـەڵام پێیوسـتە ئەمـەش بگوتـرێ کـە زانایـان لـەو بارەشـەوە کـە ئایـا: بابـای تۆبـەکار لـە بوختانکـردن، تەنیـا بەوەنـدە مـەداری سـازدەبێ و بـە تۆبـەکار (تائـب) دادەنـرێ،

---

(١) بڕوانە: (الجامع لأحکام القرآن) للقرطبي، ج١٢، ص١٨١.

(٢) بڕوانە: (الآدب الشرعیة)، لابن مفلح المقدسي، ج١ ص١٤٩.

(٣) أخرجه مسلم: ١٢١.

(٤) رواه ابن ماجه: ٤٢٥٠، وصححه الألباني.

(٥) بڕوانە: (التفسیر الکبیر) ج٢٣، ص (١٦٠-١٦١).

کە لەو تاوانەی پەشێمان بێ و، داوای لێبوردن لە خوا بکات و، عەزمی لەسەر دووبارە نەکردنەوەی جەزم بکات، یان دەبێ وێڕای ئەوە گەردنی خۆشی بە بابای بوختان پێ کردووی ئازاد بکات و، بڵاویشی بکاتەوە کە درۆی کردوە؟!

بەشێکیان کە (مالك وأحمد وإبن جرير) یان لەنێودان، ڕای یەکەمیان هەیەو[١]، بەشێکیشیان کە (سعيد بن المسيب وعطاء وطاووس والشعبي وشافعي)یان لە نێودان، ڕای دووەمیان هەیەو، ڕستەی: ﴿ إِلَّا ٱلَّذِينَ تَابُواْ مِنۢ بَعۡدِ ذَٰلِكَ وَأَصۡلَحُواْ ... ﴾ش پتەوترین بەڵگەی ڕای دووەمە[٢]، ئەوەندە هەیە ئەوەندە بەسە کە بوختانکەر بڵێ: پەشێمانم و دووبارەی ناکەمەوەو، بە مەرج ناگیرێ کە بڵێ: درۆم کردوە (كَذَبْتُ) چونکە ڕەنگە قسەکەی ڕاست بووبێ، بەڵام بەڵگەی شەرعیی تەواوی دەست نەکەوتبێ، کە ئیسپاتی دەعوایەکەی پێ بکا، کە چوار شایەدن:

﴿ ...ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ.. ﴾[٣].

ئنجا ئەگەر ناچاری بکەین هەر بڵێ: درۆم کردوە، ئەوە ناچاری دەکەین لەسەرکردنی سەرپێچییەك کە درۆکردن (كذب)ە! بەڵام بێگومان بۆ پێگوتن و گەردنی خۆ پێ ئازادکردن (التحلّل)ی بابای بوختان پێکراو (مقذوف)، پێویستە ڕەچاوی ئەوە بکرێ کە زیانی لە قازانجی زیاتر نەبێ، وەك پێشتر باسمانکردوە و، ڕوونیشمان کردۆتەوە کە لە جیاتی ئەوە چی بکات[٤].

---

(١) بڕوانە: (جامع البيان) للطبري، ج١٨، و: (فتح الباري) ج٥، ص١٥٧.

(٢) بڕوانە: سەرچاوەکانی پێشوو: هەمان بەرگ و لاپەڕە.

(٣) النور:٤.

(٤) بڕوانە: خاڵی چوارەم: (مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ) بڕگەی (٨) (گێڕانەوەی مافی خاوەن مافەکان..) و بڕوانە: (الآداب الشرعية) ج١، ص (١٠٨-١١٦).

## ٧- خواردن و خواردنەوەو بۆنکردنی سەرخۆشکەر:

مـەی (خمـر) خواردنـەوەو خـواردن و بۆنکـردن و، هـەر جۆرە بەکارهێنانێکـی دیکـەی تێکـڕای ئـەو شـتانەی کـە ئینسـان سـەرخۆش و مەسـت دەکـەن[1]، یەکێکـە لـەو تاوانـە زلانـەی کـە وێـڕای سـزاو جەزرەبـەی دواڕۆژ، سـزاو تۆڵـەی دنیاییشـیی بـۆ دانـراوە[2].

خـوا عـز وجـل فەرموویەتـی: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ﴾[3].

واتـە: ئـەی ئەوانـەی ئیمانتـان هەیـە! بێگومـان شـەڕاب و قومـارو بـت و صەنەمـەکان و تیـرەکان (ی فاڵگرتنـەوە) پیسـن لـە کـردەوەی شـەیتانن، ئنجـا توخنیـان مەکـەون، بۆئـەوەی سـەرفراز بـن.

پێغەمبەریـش (صلى اللـه عليـه وسـلم) لەوبـارەوە فەرمایشـتی یەکجـار زۆرن بـۆ نموونـە: {كُلُّ مُسْكِرٍ خَمْـرٌ وَكُلُّ مُسْكِرٍ حَـرَامٌ}[4]، واتـە: هەمـوو سـەرخۆشـکەرێك شـەڕابەو هەمـوو سـەرخۆشـکەرێك حەرامـە.

---

(١) تێکـڕای زاناو پێشـەوایان لەسـەر ئـەوە یەکدەنگـن کـە هـەر ماددەیەکـی سـەرخۆشـکەر چ ڕەق، چ شـل، چ تـۆز بـێ، هەمـان حوکمـی شـەڕابی هەیـە، چونکـە پێغەمبـەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتـی: (كل مسـكرٍ خمـر)، بڕوانـە: (الزواجـر عـن إقتـراف الكبائـر)، ج٢، ص (٧٩٧-٨٢٢) و: (جامـع العـلوم والحكـم) لابـن رجـب، ص (٥١١-٥١٦).

(٢) زانایـان دەربـارەی ئەنـدازەی ئـەو قەمچییانـەی کـە پێویسـتە لـە بابـای سـەرخۆش بدرێـن ڕاجیاییـان هەیـە لـە نێوان چـل (٤٠)و هەشـتا (٨٠)دا (ابـن تيميـة) لەوبارەوە گوتوویەتـی: (وحَـدُّه أربعون جـلدة أو ثـمانون، إن جُلِّد ثـمانين جاز بالإتفـاق، وإن اقتصر على الأربعيـن ففي الإجْـزاءِ نـزاع) بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٢٤، ص (١١٧-١١٩).

(٣) المائدة :٩٠.

(٤) أخرجه مسلم: ٢٠٠٣.

{كُلُّ شَرَابٍ أَسْكَرَ فَهُوَ حَرَامٌ}[١] ، واتە: هەر خواردنەوەیەك سەرخۆش بكات ئەوە حەرامە.

دەربارەی سزادان و قەمچیی لێدانی بابای مەیخۆرەوەش، فەرموویەتی: (من شرب الخمر فاجلدوه، فإن عاد الرابعة، فاقتلوه)[٢] ، واتە: هەركەسێك مەی خواردەوە، قەمچیی لێ بدەن. ئنجا ئەگەر بۆ جاری چوارەم هەر خواردیەوە بیكوژن، بەڵام (ابن حجر الهیتمي) گوتوویەتی: كوشتنی بابای مەیخۆرەوە لە جاری چوارەمدا، زانایان گوتوویانە نەسخ كراوەتەوە[٣].

دەربارەی تۆبەكردنی بابای بەكارهێنەری مادده عەقڵ لابەرەكان (مستعمل المواد المُخَدِّرة)، ئەگەر بەرلەوەبێ كە بگەیەنرێتە لای دادگاو دەسەڵاتی شەرعیی و، لە نێوان خۆی و خوادا بێ، ئەوە وەك پێشتریش گوتمان هەم گوناحی قیامەت و، هەم سزای دنیاشی لەسەر لادەبات و پاكی دەكاتەوە، (ابن تیمیة) لەوبارەوە گوتوویەتی: (من تاب من الزنا والسرقة أو شرب الخمر قبل أن یرفع إلى الإمام فالصحیح أن الحد یسقط عنه، كما سقط عن المحاربین إذا تابوا قبل القدرة) [٤]، واتە: هەركەسێك لە زیناو دزیی یان مەیخۆریی تۆبە بكات، بەرلەوەی بۆلای ئیمام بەرز بكرێتەوە، ئەوە ڕای ڕاست ئەوەیە كە سزای لەسەر لادەچێ، وەك چۆن ڕێگران هەركات پێش بەردەستكران، تۆبەیان كرد، سزای شەرعییان لەسەر لادەچێ.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢٤٦٩٦، والبخاري: ٢٣٩، ومسلم: ٢٠٠١.

(٢) أخرجه أحمد: ٦١٩٧، وأبو داود: ٤٤٨٣، والنسائي: ٥٦٦١، والحاكم: ٨١١٤، وقال: صحیح على شرط الشیخین.

(٣) بڕوانە: (الزواجر عن اقتراف الكبائر) ج٢، ص٨١٢، هەروەها (ابن تیمیة)ش هەروای گوتوە، بڕوانە: (مجموع الفتاوى) ج٣٤، ص ١٣٧، كە گوتوویەتی: (القتل عند أكثر العلماء منسوخ)، هەروەها گوتوویەتی: (من أجود ما یُحتجُّ به أن القتل منسوخ، حدیث: (لعنه الله ما أكثر ما یُؤْتى به إلى النبيّ (صلى الله علیه وسلم)) بڕوانە: ج٢، ص(٢٩٦-٢٩٧).

(٤) بڕوانە: (الفتاوى الكبرى) ج٤، ص٢٩٩.

بـەڵام ئەگـەر پـاش بەرزكرانـەوەی بـۆ لای قـاضی و دەسـەڵاتی شـەرعیی بـێ، ئـەوە وەك گونـاح و تاوانەكانـی دیكـە، بـە ڕای زۆربـەی هـەرە زۆری زانایـان كـە (أبـو حنيفـة ومالـك وشـافعي وأحمـد) لـە یەكێك لـە دوو قسـەكانیدا لـە نێویانـدان، گوناحی قیامـەت و ئـازارو ئەشكەنجەی ئـەوێ، بـە گوێرەی سـاغیی و ڕاستیی تۆبەكـەی لادەچـێ، بـەڵام سـزای شـەرعیی دنیـا لاناچـێ و، پێویسـتە قەمچیـی كاری بكـرێ[1].



---

(١) بڕوانـە: (رحـمة الأمـة في اختـلاف الأئمـة)، ص ٢٨٦، و: (التوبـة في ضـوء القـرآن الكريـم)، ص(٤٤٨-٤٤٩). بـەڵام لـە تەفسیری سـووڕەتی (المائـدة) و، لەكتێبـی یازدەیەمـی مەوسـووعەی: {الإسـلام كـما يتجـلّى في كتـاب اللـه}دا، ڕوونـم كردۆتـەوە كـە سـزای مەیخۆریـی سـزایەكی دیارییكـراو نیـەو، لەبازنـەی سیاسـەتی شـەرعیی دا نیـە.

## باسی سێیەم: چۆنیەتی سڕینەوەی تۆبە، بۆ ئەو گوناحانەی سزای دیارییکراویان بۆ دانەنراوە:

ئەو گوناحانەی سزای شەرعیی دیارییکراو (حد شرعي معين)یان بۆ دانەنراوە، وەك حەوت گوناح و تاوانە سزا بۆ دیارییکراوەکان نین، کە بتوانین وا بە ئاسانیی سەرژمێریان بکەین، چونکە زۆر زۆرن و هەم جۆری گەورەو هەم گچەکەشیان هەیە، بەڵام بە گشتیی دوو بەشن:

بەشێکیان پەیوەستن بە ماڵ و سامانی بەندەکانەوەو، بەشێکیشیان هەق و مافی ماددیی نین و شتی مەعنەوییین.

**یەکەم:** بەشی یەکەمیان کە مافە ماددییەکان (الحقوق المادية)ن، چەندان دەقی قورئان و سوننەت لەوبارەوە هەن، کە پێویستە لە موڵك و سامانی خەڵکی وریا بین و، بەناهەق توخنی نەکەوین، بۆ وێنە:

﴿ وَلَا تَأْكُلُوٓاْ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَٰطِلِ وَتُدْلُواْ بِهَآ إِلَى ٱلْحُكَّامِ لِتَأْكُلُواْ فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَٰلِ ٱلنَّاسِ بِٱلْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ ﴾[1].

واتە: لە نێوانتاندا سامانەکانتان بە ناهەق مەخۆن و (نەچن) ماڵ و سامانەکانتان بکەنە بەرتیل و بۆ دادوەرو حوکمڕانەکانی بەرن، بۆ ئەوەی بەشێك لە ماڵ و سامانی خەڵکی بە ناشەرعیی بخۆن، لە حاڵێکدا کە دەشزانن (ئەو ڕەفتارە چ ڕەفتارێکی دزێوە)، (البغوي) لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا نووسیویەتی: (أي لا يأكل بعضكم مال بعض بالباطل، من غير الوجه الذي أباحه الله، وأصل الباطل، الشيء الذاهب والأكل بالباطل أنواع: قد يكون بطريق الغصْب والنهب، وقد يكون بطريق الـهوى والقمار وأجرة المُغَنِّي، وقد يكون بطريق الرشوة والخيانة) بڕوانە: (معالم التنزيل) ج١، ص(١٦٥-١٦٦)، واتە: یانی: هەندێکتان ماڵی

---

(١) البقرة:١٨٨.

هەندێکتـان بەناهـەق مەخۆن، بەبێ ئـەو ڕێیـەی خـوا بـەڕەوای دانـاوە: باتیـڵ لـە ڕیشـەدا: شتـی فەوتـاوە، خواردنـی بەناهەقیـش چەنـد جۆرێکـە: دەگونجێ لـە ڕێـی دەستبەسـەرداگرتن و بردنەوەبێ و، دەگونجـێ لـە ڕێـی ئـارەزوو و قومـار و گرێـی ئافرەتـی گۆرانیـی بێژەوە بێ و، دەگونجـێ لـە ڕێـی بەرتیـل و خیانەتـەوە بـێ .

ئنجـا لەبەرئـەوەی ئێمـە لـە برگـەی هەشتـەم خاڵـی چوارەم (مەرجەکانـی تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ)دا، ئاماژەیەکمـان بـەم مەسـەلەیە کـردوە، لێرەدا دووبـارەی ناکەینـەوەو بەوەنـدە وازدێنیـن کـە یەکـی قسـەیەك لـە (أبـو حامـد الغـزالي) و (القرطبـــي) دەخوازینـەوە:

أ- (الغزالي) گوتوویەتی: (الأموال الحاضرة يَردُّها آخِذُها إلى المالك ما يُعْرَفُ له مالك معيّن، وما لا يُعرَفُ لهُ مالك، فعليه أن يتصدّق به)[1] ، واتە: ئەو سامانانەی کە لەبەردەستن، بابای بەناهەق وەرگر دەیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنیان، ئەگەر ناسراوو دیاربێ، ئەوەش کە خاوەنی ناناسرێ، پێویستە بیکاتە خێر.

ب- (القرطبـي)یش لەوبارەوە گوتوویەتی: (کە لەبەر درێژیی یەکسەر وەریدەگێڕینە سەر کوردیی)[2]:

(ڕێبـازو چۆنیەتـی ڕەفتـاری ئـەو کەسـەی کـە مـاڵ و سـامانی حەرامـی کەوتۆتـە لاو تۆبـەی کـردوەو، دەیـەوێ خۆییـان لـێ پـاك بکاتـەوە، ئەوەیـە کـە ئەگـەر بەهـۆی سـوود (ربـا)ەوە بـوو، سـەرجەم ئـەوەی کـە بەوهۆیـەوە چنگـی کەوتـوە، بیگێڕێتـەوە دەسـت ئـەو کەسـەی کـە قازانجـی لـێ کـردوە، ئەگـەر کابـرا مابـێ، ئەگەرنـا لـە جیاتـی وی بیکاتـە خێـرو چاکـە، ئنجـا ئەگـەر هـات و لێـی تێکـەڵ بـوو، نەیزانـی ئـەو ماڵـەی کـە لـە دەستیدایە، چەنـدەی حەڵاڵـەو چەنـدەی حەرامـە! ئـەوە پێویستـە چـاو وردبکاتـەوە داخۆ ئـەوەی پێویسـتە بیگێڕێتـەوە، چ ئەندازەیەکـە؟ هەتـا تـەواو دڵنیـا دەبـێ کـە ئـەوەی مـاوە هـی خۆیەتـی و حـەڕام نیـە، دەبـێ هـەر لێـی بگێڕێتـەوە

---

(١) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٤، ص ٣٧.

(٢) بڕوانە: (الجامع لأحكام القرآن)، ص(٣٦٦-٣٦٧).

بۆ ئەو کەسەی کە دەزانێ ستەمی لێ کردوە، یان سوودی لێ خواردوە، بەڵام ئەگەر بێ هیوا بوو، لە دۆزینەوەی بابای مافخوراو، پێویستە بۆی بکاتە خێر.

بەڵام ئەگەر هات و هێندەی هەق و مافی خەڵکی کەوتبوە لا، کە دەیزانی بە هیچ شێوەیەك بۆی نادرێتەوە بە خاوەنەکانیان، ئەوە تۆبەکردنی لەو حاڵەدا بەو شێوەیە دەبێ کە هەرچی هەیەتی و بە دەستیەوەیەتی، یان بیداتە نەداران، یان هەر شتێك کە بەرژەوەندیی مسوڵمانانی تێدایە، بۆی خەرج بکات و، تەنیا ئەوەندەی بۆ بمێنێتەوە کە بەشی داپۆشینی عەورەتی و بژێوی ئەو ڕۆژەی بکات! چونکە هەر ئەو ئەندازەیەی پێ دەشێ، کە لەکاتی تێگیراویی (إضطرار)دا لە ماڵی غەیر وەری بگرێ، هەرچەندە بابای ماڵ لێ وەرگیراو پێی ناخۆش بێ).

**دووەم:** بۆ مافە مەعنەوییەکان، کە پێشتر لە خاڵی چوارەمدا ئاماژەمان بەمیش کردوە، بۆ چۆنیەتی تۆبە لێکردن و خۆ لێپاککردنەوەیان، زانایان دوو ڕایان هەن[(١)]:

**یەك:** دەڵێن: پێویستە ئەو کەسەی مافەکانی لەسەرن، بابای خاوەن ماف، بۆ وێنە: غەیبەت کراو، جنێو پێدراو، فێڵ لێکراو، درۆ لەگەڵ کراو، بێ بەڵێنیی لەگەڵ کراو..هتد، ئاگادار بکاتەوە لەو خراپەو ستەمەی کە بەرانبەری کردوویەتی و، پاشان هەرچۆن بووە گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات و ڕازی بکات و قەناعەتی پێ بێنێ، (غزالي) لەو بارەوە گوتوویەتی: (وعليه أن يُعَرِف قَدَرَ جِنايتِهِ وتَعَرُّضِهِ لَهُ فالإستحلال المُبْهَمُ لايَكْفِي..)[(٢)]، واتە: لەسەری پێویستە کە ئەندازەی تاوانەکەی خۆی و، خراپە لەگەڵ کردنەکەی، پێ بڵێ و گەردنی خۆی پێ ئازادکردنی گشتی بەس نیە.

**دوو:** دەڵێن ئاگادارکردنەوەی بابای خاوەن ماف، مەرج نیەو تەنیا ئەوەندە بەسە کە لە نێوان خۆی و خوادا تۆبە بکات و، پاشان هەوڵ بدات لە چەند شوێنان و

---

(١) بڕوانە: (مدارج السالكين) لابن القيم، ج١، ص(٢٩٠-٢٩١)، کە گوتوویەتی: (فإن العلماء قد اختلفوا في كيفية التوبة منها على ثلاثة أقوال)، بەڵام لە ڕاستییدا هەر دەبنەوە بە دوو ڕا.

(٢) بڕوانە: (إحياء علوم الدين) ج٤، ص(٣٧-٣٨).

چەند غەیبەتی ئەو کەسەی کردوە، یان هەر جۆرە زیانێکی دیکەی مەعنەویی پێ گەیاندوە، بۆ سڕینەوەی، وێڕای خێر بۆکردنی، مەدح و ستایش و باسی خێرو چاکەی بکات و ..هتد.

واش پێدەچێ ڕای ڕاست و دروست ئەوەبێ کە بگوترێ:

ئەگەر هات و بابای مافخوراو، بەو ستەم و دەستدرێژییەی زانیبێ، پێویستە بابای تۆبەکار (تائب) ئاگاداری بکاتەوەو، گەردنی خۆی پێ ئازاد بکات و ڕازی بکات، مەگەر لە حاڵەتێکدا دڵنیا بێ کە باس کردن و وروژاندن (إثارة)ی مەسەلەکە ئاکامی خراپی دەبێ و، زیانی لە قازانجی پتر دەبێ، ئەوە چاکتر وایە هەر بێدەنگەی لێ بکات و، هەوڵ بدات بەشتی دیکەی وەك دوعای خێرو مەدح و چاکە لەگەڵ کردن، بۆی قەرەبوو (تعویض) بکاتەوە.

بەڵام ئەگەر بابای مافخوراوو ستەم لێکراو، نەیزانیبوو، ئەوە ئەگەر بابای تۆبەکار وایزانی کە پێی ناخۆش نابێ و، دڵنیاش بوو کە ئازادی دەکات و چاوپۆشیی دەکات، با پێی بڵێ و ئاگاداری بکاتەوەو داوای گەردنئازایی لێبکات، بەڵام ئەگەر گومانی وابوو پێی ناڕەحەت دەبێ، یان لێی خۆش نابێ، وازی لێبهێنێ چاکترو سەلامەتترە[1].

من پێموایە: وەك چۆن تۆبەو گەڕانەوەی ڕاست و ساغ بۆ لای خوا، دەبێتە مایەی پاك بوونەوەی ئینسان لە چڵك و چەپەری گوناح و تاوانە سزا بۆ دیارکراوەکان، هەوجار هەوجاریش ئەم جۆرە گوناحانەش لە ئینسان دەشوات و لادەبات، بەهێزترین بەڵگەش بۆ ئیسپاتی ئەو قسەیە، ئەوەیە کە خوای بەخشندەی بە بەزەیی لە سوورەتی (الحجرات)دا فەرموویەتی:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا يَسۡخَرۡ قَوۡمٞ مِّن قَوۡمٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُونُواْ خَيۡرٗا مِّنۡهُمۡ وَلَا نِسَآءٞ مِّن نِّسَآءٍ عَسَىٰٓ أَن يَكُنَّ خَيۡرٗا مِّنۡهُنَّۖ وَلَا تَلۡمِزُوٓاْ أَنفُسَكُمۡ وَلَا تَنَابَزُواْ بِٱلۡأَلۡقَٰبِۖ بِئۡسَ ٱلِٱسۡمُ ٱلۡفُسُوقُ

---

(١) بڕوانە: (الآداب الشرعية) ج١، ص (١١٤-١١٦).

بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿١١﴾ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ إِنَّ بَعْضَ ٱلظَّنِّ إِثْمٌ ۖ وَلَا تَجَسَّسُوا۟ وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا ۚ أَيُحِبُّ أَحَدُكُمْ أَن يَأْكُلَ لَحْمَ أَخِيهِ مَيْتًا فَكَرِهْتُمُوهُ ۚ وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ ﴾ الحجـرات:١١-١٢.

وەك دەبينيـن خـوا -تبارك وتعالـى- لـەم دوو ئايەتـەدا، شـەش جۆرە گوناحـى لـەو گوناحانـە كـە هەقـى مەعنەويـى بەنـدەكان دەخەنـە ئەسـتۆى ئينسـان، ڕوون كردوونـەوە:

١- گاڵتە پێكردن ﴿لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَىٰٓ﴾.
٢- عەيب لـێ گرتن ﴿وَلَا تَلْمِزُوٓا۟ أَنفُسَكُمْ﴾.
٣- ناوو ناتۆرە لـێ هەڵدان ﴿وَلَا تَنَابَزُوا۟ بِٱلْأَلْقَٰبِ﴾.
٤- گومانی بەد پێ بردن ﴿ٱجْتَنِبُوا۟ كَثِيرًا مِّنَ ٱلظَّنِّ﴾.
٥- جاسووسيى بەسەرەوە كردن ﴿وَلَا تَجَسَّسُوا۟﴾.
٦- پاش ملە بەخراپ باس كردن ﴿وَلَا يَغْتَب بَّعْضُكُم بَعْضًا﴾.

ئنجا ئێستا با سەرنج بدەين!

لـە كۆتايـى ئايەتـى ژمـارە (١١)دا، كـە سـێ گوناحـى يەكـەم و دووەم و سـێيەمى تێدا خراونـە ڕوو، خـواى زانـا فـەرموويەتـى:

﴿بِئْسَ ٱلِٱسْمُ ٱلْفُسُوقُ بَعْدَ ٱلْإِيمَٰنِ ۚ وَمَن لَّمْ يَتُبْ فَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلظَّٰلِمُونَ﴾[1]

واتـە: خراپتريـن نـاو نـاوى (فاســق)يێتييەو، هەركەسـێك تۆبـە نـەكات، ئـەوە ئەوانـن سـتەمكاران.

لەمـەوە دەفامرێتـەوە كـە ئـەو گوناحانـە، يەكـەم: خاوەنەكەيـان پێيـان فاسـق دەبـێ، دووەم: هەركەسـێ تۆبەيـان لـێ نـەكات، ئـەوە سـتەمكار (ظـالم)ەو، ديـارە سـتەمكاريش شايسـتەى سـزاو تۆڵـەى خوايـە!

(١) الحجرات :١١.

لە کۆتایی ئایەتی ژمارە (١٢)ش دا، کە سێ گوناحی چوارەم و پێنجەم و شەشەمی تێدا باسکراون، فەرموویەتی:

﴿وَٱتَّقُوا۟ ٱللَّهَۚ إِنَّ ٱللَّهَ تَوَّابٌ رَّحِيمٌ﴾[(١)]،

واتە: پارێزکاریی خوا بکەن، بێگومان خوا زۆر تۆبە وەرگری بە بەزەییە.

لەمەشەوە دەفامرێتەوە کە ئەو جۆرە گوناحانە، لە ئەنجامی پارێزکاریی و گەڕانەوەی ڕاست و ساغدا، خوا دەیانبەخشێ و تۆبەی بابای تۆبەکاریان لەسەر وەردەگرێ و، بە بەزەیی خۆیشی مامەڵەی لەگەڵ دەکات!

کەواتە: مسۆگەر مسۆگەر تۆبەی ڕاست و ساغ، مایەی جۆشانی دەریای بێبنی ڕەحمەت و کەرەم و بەخششی خوای پەروەردگاری بەخشندەیەو، بێگومان هیچ گوناح و تاوانێکیش، خۆی لە بەرانبەر شەپۆلەکانی دەریای ڕەحمەتی خوادا ناگرێ!



---

(١) الحجرات: ١٢.

## باسی چوارەم: چۆنیەتی سڕینەوەی تۆبە بۆ گوناحە زلەکان:

خاوەن و ئەنجامدەرانی گوناحە گەورەکان (أصحاب ومرتكبي الكبائر) بە گشتیی دوو حاڵەتیان هەن:

حاڵەتی یەکەم: کە تۆبەیەکی ڕاست و ساغیان لە گوناحەکانیان کردبێ، ئەمانە بە ڕای زۆربەی هەرە زۆری نزیك بە یەکدەنگیی زانایانی ئیسلام لە (أهل السنة والجماعة والأشاعرة والمعتزلة)[1]، خوای لێبوردەو بە بەزەیی وەك گفت و بەڵێنی داوە، لێیان خۆش دەبێ و پاکیان دەکاتەوە، ئاشکرایە کە دەشڵێین: گوناحە زلەکان (کبائر) مەبەستمان پێی سەرجەم گوناحە گەورەکانە، وەك کاتی خۆی پێناسەمان کردوون بە: سزای دیارییکراو (العقوبة المحددة)[2] بۆ دانراو و، بۆ دانەنراوەوە.

(النَّووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (فمذهب أهل السنة وما عليه أهل الحق من السلف والخلف، إن مات مُوَحِّداً، دخل الجنة قطعاً على كل حال، فإن كان سالماً من المعاصي كالصغير والمجنون، والذي اتصل جنونه بالبلوغ، والتائب توبة صحيحة من الشرك أو غيره من المعاصي..فكل هؤلاء يدخلون الجنة ولا يدخلون النار أصلاً)[3]، واتە: ڕای ئەهلی سوننەت و ئەوەی ئەهلی هەق لە زانایانی پێشین و پاشین لەسەرنی، ئەوەیە کە ئەگەر بە ئیمانەوە مردبێ، هەرچۆن بێ بە مسۆگەریی هەر دەچێتە بەهەشت، ئنجا ئەگەر لە گوناحان سەلامەت بووبێ، وەك منداڵ و شێت و، کەسێك بە شێتیی باڵغ بووبێ و، تۆبەکارێك کە تۆبەیەکی

---

(١) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١، ص ٢١٧، و: (التفسير الكبير) للرازي، ج١، ص١٢٤.

(٢) زاراوەی (حد) بۆ سزا شەرعییەکان، دوایی پەیدا کراوە، بڕوانە: (مجموع الفتاوى)، ج ٢٨، ص(١٣٨-١٣٩).

(٣) بڕوانە: (صحيح مسلم بشرح النووي) ج١، ص ٢١٧.

ڕاست و ساغی لە شیرك یان باقی گوناحەكان كردبێ..تێكڕای ئەوانە بێئەوەی بچنە دۆزەخەوە، یەكسەر دەچنە بەهەشتێ.

هەروەها (التفتازاني) گوتوویەتی[١]: (إتفقت الأمة على العفو عن الصغائر مطلقاً وعن الكبائر بعد التوبة)، واتە: ئۆممەت لەسەر ئەوە ڕێككەوتوە (دیارە مەبەست زانایانی ئۆممەتی ئیسلامە) كە گوناحە گچكەكان یەكسەرو، گەورەكانیش پاش تۆبە دەبەخشرێن.

هەروەها (الشهرستاني)یش هەمان قسەی كردوە،[٢] دیارە بەڵگەی زانایانیش لەسەر ئەو یەكدەنگییە، چەندان دەقی ڕاست و ڕاشكاوی قورئان و سوننەتن، بۆ وێنە:

١- ﴿ وَهُوَ ٱلَّذِى يَقْبَلُ ٱلتَّوْبَةَ عَنْ عِبَادِهِۦ وَيَعْفُوا۟ عَنِ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ﴾[٣]، واتە: (خوا) ئەو زاتەیە كە تۆبە لە بەندەكانی وەردەگرێ و لە خراپەكان دەبووری...

٢- ﴿ وَإِنِّى لَغَفَّارٌ لِّمَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ صَـٰلِحًا ثُمَّ ٱهْتَدَىٰ ﴾[٤]، واتە: بەدڵنیاییی من زۆر لێبوردە بۆ هەر كەس بگەڕێتەوەو، بڕوابێنێ وكردەوەی باش بكات وڕاستەڕێ بێ.

٣- ﴿ إِنَّمَا ٱلتَّوْبَةُ عَلَى ٱللَّهِ لِلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلسُّوٓءَ بِجَهَـٰلَةٍ ثُمَّ يَتُوبُونَ مِن قَرِيبٍ فَأُو۟لَـٰٓئِكَ يَتُوبُ ٱللَّهُ عَلَيْهِمْ ۗ وَكَانَ ٱللَّهُ عَلِيمًا حَكِيمًا ﴾[٥]، كە پێشتر مانامان كردوە.

٤- {إِنَّ اللَّهَ عَزَّ وَجَلَّ يَبْسُطُ يَدَهُ بِاللَّيْلِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ النَّهَارِ وَيَبْسُطُ يَدَهُ بِالنَّهَارِ لِيَتُوبَ مُسِيءُ اللَّيْلِ، حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ مِنْ مَغْرِبِهَا}[٦] ، واتە: بێگومان خوا بە شەوگار دەستی

---

(١) بڕوانە: (شرح المقاصد) للتفتازاني)، ص ١٧٢.

(٢) بڕوانە: (الفصل في الملل والنحل) للشهرستاني، ج١، ص١٣٣.

(٣) الشورى :٢٥.

(٤) طه:٨٢ .

(٥) النساء:١٧.

(٦) أخرجه أحمد: ١٩٥٤٧، ومسلم: ٢٧٥٩.

خۆی دەکاتەوە، بۆ ئەوەی گوناحباری ڕۆژگار بگەڕێتەوەو، بە ڕۆژێ دەستی خۆی دەکاتەوە، تاکو گوناحباری شەوێ بگەڕێتەوە، هەتا خۆر لە ڕۆژئاواوە هەڵدێ.

**حاڵەتی دووەم:** کە بەبێ تۆبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا مردوون، ئەوانەش بەڕای زۆربەی هەرە زۆری ئەهلی ئیسلام لە (أهل السنة وبعض شيوخ المعتزلة والكلابية والكرامية والأشاعرة والمرجئة)، دەکەونە بەر ویست (مشيئة)ی خوا، هەرکامێکیانی ویست، لێی دەبوورێ و دەیخاتە بەهەشتەوەو، بۆ هەرکەسێکیشی نەیویست، ئازاری دەدا، پاشان دەیخاتە بەهەشتەوە[١].

(النَّووي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (رأي أهل السنة والجماعة أن مرتكب الكبيرة إما أن يعفو الله تعالى عنه فيدخله الجنة، أو إن شاء عذّبه القدر الذي يريد سبحانه وتعالى ثم يدخله الجنة، فلا يُخَلَّدُ في النار)[٢]، واتە: ڕای ئەهلی سوننەت و جەماعەت لەبارەی ئەنجامدەری گوناحی گەورەوە، ئەوەیە کە: یان ئەوەتا خوای بەرز دەیبەخشێ و دەیخاتە بە هەشتەوە، یان ئەگەر ویستی ئازاری دەدا بەو ئەندازەیەی کە پاکیی و بەرزیی بۆ وی، دەیەوێ، پاشان دەیخاتە بەهەشتەوەو، لە ئاگری دۆزەخدا بە هەمیشەیی نامێنێتەوە.

هەروەها هەرکام لە (الرازي والشهرستاني)یش هەمان قسەیان کردوە[٣].

بەڵگەی زاناو پێشەوایانیش لەوبارەوە، چەندان دەقی قورئان و سوننەتن، بۆ وێنە: ﴿ إِنَّ ٱللَّهَ لَا يَغْفِرُ أَن يُشْرَكَ بِهِۦ وَيَغْفِرُ مَا دُونَ ذَٰلِكَ لِمَن يَشَآءُ ﴾[٤]،

---

(١) بڕوانە: (منهاج السنة النبوية)، لابن تيمية، ج١، ص١٤، و: (شرح المقاصد)، ص١٠٧، و: (الفصل في الملل والنحل)، ج٤، ص٤٥، و: (عمدة القاري شرح صحيح البخاري)، ج١، ص٥٩.

(٢) بڕوانە: (شرح صحيح مسلم) للنووي، ج١، ص(٢١٧-٢٢٠).

(٣) بڕوانە: (إعتقادات فرق المسلمين) للرازي، ص ٧١، و: (الملل و النحل)، ج١، ص(١٣٢-١٣٣) للمشهداني.

(٤) النساء :١١٦.

واتـە: خـوا بـە مسـۆگەریی لـەوە نابـووریٚ کـە هاوبەشـی بـۆ دابنـریٚ، بـەڵام بێجگـە لـەوە هـەر کەسـێکی بـویٚ لیٚـی دەبـووریٚ.

١- ﴿ غَافِرِ ٱلذَّنۢبِ وَقَابِلِ ٱلتَّوۡبِ ﴾[١]، واتە: لێبوردەی گوناح و وەرگری تۆبەیە..

٢- {وَمَنْ أَصَابَ مِنْ ذَلِكَ شَيْئًا فَأُخِذَ بِهِ فِي الدُّنْيَا، فَهُوَ كَفَّارَةٌ لَهُ وَطَهُورٌ وَمَنْ سَتَرَهُ اللَّهُ، فَذَلِكَ إِلَى اللَّهِ إِنْ شَاءَ عَذَّبَهُ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُ}[٢] ، كە پێشتر ماناممان کردوە.

٣- {أَخَّرْتُ شَفَاعَتِي لأَهْلِ الكَبَائِرِ يَوْمَ القِيَامَةِ}[٣]، واتە: تکای خۆمم بۆ خاوەنی گوناحە زلەکان لە ڕۆژی قیامەتیٚ هەڵگرتوە.

ئەمـەش بـە کورتیـی چۆنیەتـی سڕینـەوەی تۆبـە (بـەڵام تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ) بـوو، بـۆ سـەرجەم گوناحـە زلـەکان بـە هەمـوو جۆرو شێوەکانیانەوە.

کۆتایی ئەم بڕگەیەش بەم ڕوونکردنەوە پێویستە دێنین:

(معتزلـة)کان ڕایـان وایـە کـە وەرگرتنـی تۆبـەی بەنـدەو پاککردنـەوەی لـە گونـاح و تاوانەکانـی (پـاش تۆبەکـردن) لەسـەر خـوا فـەرزە!!

بـەڵام (أهـل السـنة) ئـەو ڕایـەی موعتەزیلەکانیـان بـە بێئەدەبیـی بەرانبـەر بـە خـوا دانـاوەو گوتوویانـە: خـوا هیـچ شـتێکی ناگونجـیٚ لەسـەر فـەرزبیٚ، ئەوەنـدە هەیـە خـوا خـۆی بەڵێنـی داوە کـە تۆبـەی تۆبـەکاران وەربگـریٚ و، لـە گونـاح و هەڵەکانیـان ببـووریٚ، ئنجـا لەبەرئـەوەی بیٚ بەڵێنیـی و پەیمـان شـکێنیی لە خوا ناوەشـێتەوە، لەسـەر ئـەو بناغەیـە دەتوانیـن بڵێیـن: بـە تەئکیـد خـوا تۆبـەکان وەردەگـریٚ و گوناحـەکان دەبـووریٚ، چونکـە خـۆی فەرموویەتـی و مـوژدەی بـە بەندەکانـی داوە، نـەك لەبەرئـەوەی لەسـەری فـەرزە[٤].

---

(١) غافر :٣

(٢) أخرجه البخاري: ٦٤١٦.

(٣) أخرجه البزار: ٣٢٥٤، قال الهيثمي (٢١١/١٠): إسناده جيد.

(٤) بڕوانە: (التفسير الكبير)، ج١٠، ص(١٢٤-١٢٥)، فخرالدين الرازي.

## باسی پێنجەم: چۆنیەتی سڕینەوەی تۆبە بۆ وردە گوناح و هەڵەو پەڵەکان:

پێشتریش باسی ئەو مەسەلەیەمان کرد، بۆیە بەکورتیی دەڵێین:

١- بە یەکدەنگیی زانایان (إجماع العلماء) تۆبەکردن لە وردە گوناحەکانیش فەرزە، (الآلوسي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (التوبة من الصغائر واجبة، على ما نقل الأشعري، وحَكى إمام الحرمين الإجماع عليه)[1]، واتە: تۆبەکردن لە گوناهە گچکەکانیش فەرزە، وەك (الأشعري) هێناویەتی و (إمام الحرمين) یش یەکدەنگی زانایانی لەسەر گێڕاوەتەوە.

٢- بەڵام لەوبارەوە کە ئایا تەنیا خۆپاراستن لە گوناحە زلەکان (الإجتناب عن الكبائر) بەسە بۆ بەخشرانی گوناحە گچکەکان، یان پێویستە وێڕای ئەوە کردەوەی باشیش ئەنجام بدرێ؟! زانایان ڕاجیاییان هەیە، هەرچی زۆربەو جەماوەریانن کە (أهل السنة والجماعة)ن دەڵێن: پێویستە وێڕای خۆ دوورگرتن لە گوناحە زلەکان، کردەوە باشەکان (الأعمال الصالحة)یش ئەنجام بدات، (معتزلة)ش گوتوویانە: تەنیا خۆپاراستـن لە گوناحـە زلەکان بەسە![2]

٣- بەندەش وای بۆ دەچێ کە ئەگەر چاك لە چەمك و واتای (الكبائر) گوناحە زلەکان، حاڵی بین ئەو ڕاجیاییە پاساوی نامێنێ!

چونکـە: وەك پێشتـر ڕوونمـان کردۆتـەوە، لـە پێناسـەی گونـاح و سـەرپێچییدا، کە وەك چۆن ئەنجامدانـی قەدەغەکراوەکان (إرتـكاب المحرّمـات) وەك قەتـڵ و زینـاو دزیی..گوناحـە، چواندنـی فەڕزەکان (ترك الواجبات)یش هـەر گوناحـە!

کەواتـە: خـۆ پاراسـتن لـە گوناحـە زلـەکان (إجتنـاب الكبائـر) کاتێـك دێتـە دی، کـە ئینسـانی مسـوڵمان، وێـڕای توخـن نەکـەوتنـی قەدەغەکـراوەکان، دووچـاری چواندنـی فەڕزەکانیـش نەبـێ، ئایەتـی:

---

(١) بڕوانە: (روح المعاني في تفسير القرآن العظيم والسبع المثاني)، ج١٢، ص ٥٩.

(٢) بڕوانە: (فتح الباري)، ج٢، ص ١٢.

﴿إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ ۚ ذَٰلِكَ ذِكْرَىٰ لِلذَّٰكِرِينَ﴾[١]يش و ئەم بەسەرهاتەش، کەوا پێی دەچێ ئایەتەکە هۆی هاتنە خوار (سبب النزول)ی بێ، چاکترین بەڵگەی ئیسپاتی قسەی بەندەن:

{عَنْ عَبْدِ اللَّهِ قَالَ جَاءَ رَجُلٌ إِلَى النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنِّي عَالَجْتُ امْرَأَةً فِي أَقْصَى الْمَدِينَةِ، وَإِنِّي أَصَبْتُ مِنْهَا مَا دُونَ أَنْ أَمَسَّهَا، فَأَنَا هَذَا فَاقْضِ فِيَّ مَا شِئْتَ، فَقَالَ لَهُ عُمَرُ: لَقَدْ سَتَرَكَ اللَّهُ لَوْ سَتَرْتَ نَفْسَكَ، قَالَ: فَلَمْ يَرُدَّ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ شَيْئًا، فَقَامَ الرَّجُلُ فَانْطَلَقَ فَأَتْبَعَهُ النَّبِيُّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ رَجُلًا دَعَاهُ، وَتَلَا عَلَيْهِ هَذِهِ الْآيَةَ: ﴿وَأَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ طَرَفَيِ ٱلنَّهَارِ وَزُلَفًا مِّنَ ٱلَّيْلِ ۚ إِنَّ ٱلْحَسَنَٰتِ يُذْهِبْنَ ٱلسَّيِّـَٔاتِ﴾[٢]، فَقَالَ رَجُلٌ مِنَ الْقَوْمِ يَا نَبِيَّ اللَّهِ! هَذَا لَهُ خَاصَّةً؟ قَالَ: بَلْ لِلنَّاسِ كَافَّةً}[٣]

واتە: پیاوێك هاتە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! لەوپەڕی شار خەریکی ژنێك بووم و دەستم گەیاندێ بێ ئەوەی لەگەڵی جووت بم، ئنجا ئەوە لەبەردەستتم چیت دەوێ بۆم بڕیار بدە! عومەر پێی گوت: خوا بۆی پۆشیبووی، ئەگەر بۆ خۆتت پۆشیبایە! (دەڵێ) پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هیچی نەگوت، ئنجا کابرا هەستاو ڕۆیی، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) پیاوێکی دواخست و بانگی کردو، ئەم ئایەتەی بەسەردا خوێندەوە: {ئەمسەرەو سەری ڕۆژگارو چەند بەشێك لە شەوگار نوێژ بەرپا بکە! بێگومان چاکەکان خراپەکان لادەبەن}، پیاوێك لە کۆمەڵەکە گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا! ئەمە تەنیاو تایبەت بۆ ئەوە؟! فەرمووی: بەڵکو بۆ تێکڕای خەڵکە.

---

(١) هود:١١٤.

(٢) هود:١١٤.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٧٦٣.

کەواتـە: مشـتومڕی نێـوان (أهـل السـنة) و (معتزلـة) لـەم مەسـەلەیەداو، بـەو ڕوونکردنـەوەوە کـە گـوتمـان، دەبێتـە ڕاجیاییەکـی وشـەیی (إختـلاف لفظـي) و بـەم جۆرەش هیـچ پێویسـت نـاکات بڵێیـن، ئایەتـی:

﴿ إِن تَجۡتَنِبُواْ كَبَآئِرَ مَا تُنۡهَوۡنَ عَنۡهُ نُكَفِّرۡ عَنكُمۡ سَيِّـَٔاتِكُمۡ ﴾[1].

کـە پتەوتریـن بەڵگـەی (معتزلة)یـە، حوکمێکـی ڕەهـا (مطلـق)ی تێدایـەو، بـە فەرموودەکانـی پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسلم) بەنـددار (مقیّـد) کـراوە، چونکـە فەرموودەکانیـش هـەر پشـتگیریی واتـای ئایەتەکـە دەکـەن و لێیـان جیـاواز نیـن، وەك سـەرجەم فەرمایشـتەکانی پێغەمبـەر (صلی الله علیـه وسلم) لەگـەڵ ئایەتەکانـی قورئانـدا، بـۆ وێنـە ئـەم فەرموودەیـە: {أَرَأَيْتُـمْ لَـوْ أَنَّ نَهْـرًا بِبَـابِ أَحَدِكُـمْ يَغْتَسِـلُ مِنْـهُ كُلَّ يَـوْمٍ خَمْـسَ مَـرَّاتٍ، هَـلْ يَبْقَـى مِـنْ دَرَنِـهِ شَيْءٌ ؟ قالـوا: لا يَبْقَـى مِـنْ دَرَنِـهِ شَيْءٌ، قَـالَ: فَذَلِـكَ مَثَـلُ الصَّلَـوَاتِ الخَمْـسِ يَمْحُـو اللـهُ بِهِـنَّ الخَطَايَـا}[2]، واتـە: ئایـا دەزانـن ئەگـەر بێـت و بەبـەر دەرگـای یەکێکتـان دا ڕووبارێکـی لـێبێ و، هەمـوو ڕۆژێـك پێنـج کەڕەتـان خـۆی لـێ بشـوات، ئایـا هیـچ چڵکـی پێـوە دەمێنـێ؟! گوتیـان: هیـچ چڵکـی پێـوە نامێنـێ، فەرمـووی: دەجـا ئـەوە وێنـەی پێنـج نوێژەکانـە، کـە خـوا گوناحانیـان پـێ دەسڕێتەوە، کەواتـە: پێنـج نوێـژە فـەرزەکان (لـە فەرموودەی دیکەشـدا باسـی جومعـەو ڕەمەزانیـش کـراوە)، دەبنـە هـۆی لابردنـی گوناحـە گچکەکان، دەجـا بێگومـان وەك چـۆن پـاش ئیمـان، نوێژکردن چاکتریـن چاکـە (حسـنة)یە، لـە دوای کوفـرو شیـرك و نیفاقیـش، نوێژنەکـردن خراپتریـن خراپـە (سـیئة)یە... کەواتـە: ڕاسـتە بەهـۆی خۆپاراسـتن لـە گوناحـە گـەورەکان، کـە یەکیـان نوێـژ چواندنـە، گوناحـە گچکـەکان دەسـڕێنەوە.

---

(١) النساء :٣١.

(٢) أخرجه البخاري: ٥٢٨، ومسلم: ٦٦٧.

## باسی شەشەم: گۆڕینی گوناح و تاوانەکان بە چاکەو خێر:

یەکی دیکە لە شوێنەوارەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ، بریتیە لە گۆڕینی خراپەو گوناحەکانی بابای تۆبەکار، بۆ چاکەکان (الحسنات)، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَءَامَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَٰلِحًا فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمْ حَسَنَٰتٍۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا ﴾[1].

واتە: {گوناحباران جێگایان دۆزەخە} بێجگە لە کەسانێك کە دەگەڕێنەوەو ئیمان دێنن و کردەوەی باش ئەنجام دەدەن، ئا ئەوانە خوا خراپەکانیان بۆ بەچاکان دەگۆڕێ و، خوا لێبوردەی بە بەزەییە.

ئنجا لێرەدا زانایان لەبارەی چۆنیەتی ئەو (گۆڕانی خراپە بە چاکە)یە، ڕاجیاییان هەیەو، بەگشتیی دوو ڕایان هەن:

**یەکەم:** دەڵێن: مەبەست لە گۆڕانی خراپەکانیان بە چاکان لە دنیادایە و، گۆڕینەکەش ئەوەیە کە بابای گوناحکار پاش تۆبەکردن و گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە سایەی ئیمان و تەقوایەوە، لە جیاتی خراپەو گوناح کە جاران دەیکردن، سەرگەرمی چاکەو تاعەت دەبێ، (بغوي) لەوبارەوە گوتوویەتی: (يُبَدِّلُهم الله بقبائح أعمالهم في الشرك، محاسن الأعمال في الإسلام، فيبدلهم بالشرك إيماناً، وبقتل المؤمنين قتل المشركين، وبالزنا عِفَّةً وإحصانا)[2].

واتە: خوا کردەوە ناقۆڵایەکانی نێو شیرکیان بۆ دەگۆڕێ بۆ کردەوە چاکەکانی نێو ئیسلامەتیی، بەو جۆرە شیرکیان بۆ بە ئیمان دەگۆڕێ و، کوشتنی مسوڵمانان، بۆ کوشتنی هاوبەشدانەران و، داوێن پیسییان بۆ داوێن پاکیی و پارێز دەگۆڕێ.

---

(١) الفرقان: ٧٠.

(٢) بڕوانە: (معالم التنزيل)، ج٥، ص ١٥٧.

**دووەم:** دەڵێن: ئەو گوناح و خراپە بە چاکەو تاعەت گۆڕانەی تۆبەکاران لە قیامەتدایەو، مەبەستیش لەو گۆڕانە، ئەوەیە کە خوای لێبوردەو بەخشندە لە جێی خراپەو گوناحەکانیان، چاکەو تاعەتیان لە لیستی کردەوەکانیاندا بۆدەنووسێ.

ئەمانیش جگە لە مانای ئاشکرای ئایەتەکە، چەند فەرموودەیەکیش بە بەڵگە دێننەوە، کە ئەمە یەکێکیانە: {عَنْ أَبِي ذَرٍّ، قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم: إِنِّي لأَعْلَمُ آخِرَ أَهْلِ الْجَنَّةِ دُخُولا ، وَآخَرَ أَهْلِ النَّارِ خُرُوجًا مِنْهَا، رَجُلٌ يُؤْتَى بِهِ فَيُقَالُ: اعْرِضُوا عَلَيْهِ صِغَارَ ذُنُوبِهِ، وَارْفَعُوا عَنْهُ كِبَارَهَا، قَالَ: فَتُعْرَضُ عَلَيْهِ صِغَارُ ذُنُوبِهِ ، فَيُقَالُ: عَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا، وَعَمِلْتَ يَوْمَ كَذَا وَكَذَا كَذَا وَكَذَا ، فَيَقُولُ: نَعَمْ ، لا يَسْتَطِيعُ أَنْ يُنْكِرَ، وَهُوَ مُشْفِقٌ مِنْ كِبَارِ ذُنُوبِهِ أَنْ تُعْرَضَ عَلَيْهِ ، فَيُقَالُ لَهُ: فَإِنَّ لَكَ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ حَسَنَةً ، فَيَقُولُ: رَبِّ قَدْ عَمِلْتُ أَشْيَاءَ لا أَرَى هَاهُنَا ، قَالَ: فَلَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِ - صلى الله عليه وسلم - ضَحِكَ حَتَّى بَدَتْ نَوَاجِذُهُ}[1].

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: وەك (أبو ذر) گێڕاویەتەوە: (من دەزانم کێ لە ئەهلی بەهەشتێ دوایین کەسە کە دەچێتە بەهەشتێ و، کێ دوایین کەسی نێو ئاگری دۆزەخە، کە لێی دەچێتە دەرێ.

پیاوێکە ڕۆژی قیامەتێ دەهێنرێ و دەگوترێ: گوناحە گچکەکانی پێشان بدەن، بەڵام گەورەکانی لێ بشارنەوە، ئنجا گوناحە وردەکانی دەخرێنە بەرچاوو پێی دەگوترێ: فلان و فیسار ڕۆژە، فلان و فیسار کردەوەیەت کردوە، فلان و فیسار ڕۆژە، فلان و فیسارکردەوەیەت کردوە! دەڵێ: بەڵێ، ناتوانێ نکووڵیی بکات، بەڵام هەر لە گوناحە زلەکانی دەترسێ کە بخرێنە پێش چاوی، ئنجا پێی دەگوترێ: {فَإِنَّ لَكَ مَكَانَ كُلِّ سَيِّئَةٍ حَسَنَةً} لە جێی هەر خراپەیەك چاکەیەکت هەیە! ئنجا دەڵێ: پەروەردگارم! هەندێك شتم کردوە لێرەدا نایانبینم! ئنجا من پێغەمبەری خوام (صلى الله عليه وسلم) بینی پێکەنی هەتا ددانەکانی دەرکەوتن)!!.

---

(١) أخرجه أحمد: ٢١٤٣٠، ومسلم: ١٩٠، والترمذي: ٢٥٩٦.

هەروەها هەمـان فەرمـوودە (أحمد)یش هێناویەتی و، لە درێژەی فەرمایشتەکەدا ئـەم تەعبیـرە هاتـوە: ((... وهـو مشـفق مـن الكبـار، فَيُقَـالُ: أعطـوه مـكان كل سـيئة حسنة)[1].

هەڵبەتـە ئـەم مانایـەش هیـچ گـرێ و ئیشـکالێکی نیـەو، وەك واقیعیـش هـەر ڕاسـتەو، بابـای گـەڕاوە (تائـب) لەجیاتـی خراپـە، چاکـە دەکات، شـایانی باسیشـە کـە ڕەخنەلێگرانـی لایەنگرانـی ئـەم ڕایـە، چەنـد بەڵگەیەکـی عەقڵییـان هێناونـەوە، بـەڵام هیـچ بەڵگـەی قورئـان و سـوننەتیان پـێ نیـەو، بەڵگـە عەقڵییەکانیشـیان زیاتـر لـە بازنـەی بـەدوور زانیـن (إسـتبعاد)دا دەسـووڕێنەوە. بـۆ وێنـە[2]:

١- چۆن گوناحی بوغزێنراو لە لای خوا، دەگۆڕرێ بۆ کردەوەیەکی خۆشویستراوی خوا؟!

٢- ئەگەر خراپەو گوناحەکان بە چاکەو تاعەت گۆڕابان، دەبووایە تۆبەکارێکی گوناحکار، حاڵی لە بابەیەکی گوناح نەکردوو چاکتر بێ، ئەمەش ڕاست نیە کە ئینسـانی بێ گوناح، لە هی خاوەن گوناح، چاکتـر نەبێ!

٣- وەك چۆن چاکەیەك کە لە ئینسان هەڵدەوەشێتەوە، خراپەی نایەتە جێ، بەڵکو تەنیا خۆی نامێنێ و هیچی دیکە، خراپەش بە هەمان شێوە، کە بەهۆی تۆبەوە لاچوو، ناگونجێ چاکە بێتە شوێنی.

بـەڵام پـاش هەواڵدانـی پێغەمبـەری خـوا (صلـی اللـه علیـه وسـلم) هیـچ کـەس هەقـی قسـەو ڕادەربڕینـی نامێنـێ و، ئـەو بەڵگـە عەقڵییانـەش کە لایەنگرانـی ڕای یەکـەم هێنابوونیانـەوە، جگـە لـەوەی کـە دەبـێ هەمیشـە لـە بەرانبـەر بەڵگـە ڕاسـت و ڕاشـکاو (صحیـح صریـح)ی شـەرعییدا، عەقڵ بەخۆیدا بچێتـەوەو چاو بەخۆیدا بگێڕێتـەوە، بەڵـێ وێـڕای ئـەوەش، هیـچ کام لـە بەڵگـە عەقڵییـەکان هێـزو پێزێکـی وایـان نیـەو وەك گوتوومانـە: سـەرجەمیان لـە جوغـزی بـەدوور زانیـن (إسـتبعاد)دا

---

(١) بڕوانە: (المسند)، ج٥، ص١٥٧.

(٢) ئـەو بەڵگانـە (إبـن القیـم) لـە کتێبـی (طـرق الهجرتیـن)، ص ٢٤٦ دا، لـە خاوەنـی ئـەو ڕایـەوە هێناونـی و وا پێناچـێ خـۆی لەگەڵیـان هاودەنگبـێ.

دەخولێنـەوەو، ئەمیش بـە تەنیـا پاسـاو (مبـرِّر)ی تەئویلـی ئـەو ئایەتـە قورئانییـە ڕاشـکاوو ئاشـکرایە نیـە:

﴿ فَأُوْلَٰٓئِكَ يُبَدِّلُ ٱللَّهُ سَيِّـَٔاتِهِمۡ حَسَنَٰتٖۗ وَكَانَ ٱللَّهُ غَفُورٗا رَّحِيمٗا ﴾[١].

بەڵـێ خـوای پـەروەردگار، بەخشـەرە بەرانبـەر بـە بەندەکانـی و خـاوەن لوتـف و لێبوردەیـە بـۆ پۆشـینی گونـاح و خراپەکانیـان و، بـە بەزەیـی و میهرەبانـە بـۆ گۆڕینیـان بـە چاکـەو تاعـەت و، کـەرەم و بەخشـندەیی بێسـنووری خـواش شـتی وای لێدەوەشـێتەوە، کـە لـە هیـچ عـەقڵ ئەندێشـەو خەیاڵێکدا جێـی نەبێتـەوەو نەحەوێتەوە.

پێشـموایە[٢] ڕاسـتتـر وایـە کـە بـۆ تـەفسـیری ئایەتـی ناوبـراو بگوتـرێ: هیـچ ناکۆکییـەك لـە نێـوان ڕای یەکـەم و دووەمـدا نیـە، کـە ناچـار بیـن حەتمەن یەکیـان بگریـن و، ئـەوی دیکـە واز لـێ بهێنیـن، چونکـە: خـوای بەخشـندەی بـە بەزەیـی، بـە موتڵەقیـی فەرموویەتـی: (يبـّدل اللـه سـيئاتهم حسـنات) کەواتـە: چاکتـر وایـە هـەردووك ڕایـەکان پێکـەوە کۆبکەینـەوەو بڵێیـن: خـوا هـەم لـە دنیـاو هـەم لـە قیامەتـدا، خراپـەو گوناحەکانـی بابـای تۆبـەی ڕاسـت و سـاغ کـردوو، بـە چاکـەو تاعـەت دەگـۆڕێ، لـە دنیـادا لەسـایەی تۆبـەو ئیمـان و پارێزکارییـەوە، وایـان لـێدێ، کـە لەمـەودوا لـە جیاتـی خراپـە، چاکـەو لەباتـی سـەرپێچیی (معصيـة)، فەرمانبەریـی (طاعـة) بکـەن، لـە دواڕۆژیشـدا خـوا لـە جێـی هـەر خراپەیـەك، چاکەیەکیـان بـۆ دادەنـێ، وەك لـە دەقـی فەرمـوودەی پێغەمبـەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتـوە، کـە پێشـتـر هێناومانـەو هـەرکام لـە (مسـلم) و (أحمـد) لـە (أبـو ذر الغفاري)یـەوە گێڕاویانەتـەوە[٣].

---

(١) الفرقان:٧٠

(٢) خاوەنـی کتێبـی (التـوبة فـي ضـوء القرآن الكريـم)یش هەمـان ڕای پەسـەندی کـردوە، بڕوانـــە: ص (٥٠٩-٥١٠) و، پێـم وایـە (ابـن جريـر الطبـري)یش وەك عادەتـی خـۆی لـە فراوانکردنی چەمك و واتای ئایەتەکانی قورئاندا کە بە موتڵەقیـی هاتبن، مادام نیشـانەیەك لەسـەر تەسـككردنەوەیان نەبـێ، هەمـان ڕای هەیـە.

(٣) لە تـەفسیری سووڕەتی (الفرقان)دا زیاتر قسـەمان لەسـەر چەمکی ئەو ئایەتە کردووەو وەك

لێرەشدا کۆتایی بە تەوەری یەکەم لە بەشی حەوتەم دێنین، کە بریتی بوو لە خستنە ڕووی: (شوێنەواری تۆبە لە سڕینەوەی گوناحدا) و دەچینە سەر تەوەری دووەم و کۆتایی لە بەشی حەوتەم، کە بریتیە لە: (کاریگەریی و بەرهەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە چاککردنی ئینساندا).



ئێرە هەردوو ڕایەکەمان پێکەوە کۆکردوونەوە، بەڵام (الطبري) ڕای یەکەمی هەڵبژاردووە، هی دووەمی بە نەگونجاو و دوور داناوە.

## تەوەری دووەم:

## کاریگەریی و بەرهەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا (توبة)، لە چاککردنی ئینسـاندا

خوێنەری بەڕێــزا!

لـە ڕاسـتییدا کاریگەریـی تۆبـەو گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، کاریگەریـی (تأثیــر)یەکی هەمەلایەنەیـەو، خێـرو بەرەکـەت و بەرهەمەکانـی تۆبـە، زۆرو جـۆراو جـۆرن و، دیـارە گەورەتریـن و چاکتـریـن و پیـرۆزترین بەرهەمـی گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا، ئەوەیـە کـە لـە دوارِۆژدا دێتـەدی، کە لێبوردن و بەخشیـن و بەزەیی خوای پەروەردگارو تاوانپۆشـە، بەڵام ئێمـە لێرەدا تەنیـا ئامـاژە بـە هەندێك لـە بەرهەمـە دنیاییەکانی تۆبـە دەکەین، کە بێگومان پەیوەندیی ڕاستەوخۆو پتەویشیان بـە دوارِۆژەوە هـەر هەیـە، ئنجا هەرچۆن بووە، ئێمـە هـەوڵ دەدەیـن کـە لـە قـەدەر قەبارەی ئـەم کتێبـە، لـە حـەوت باسـی کـورت و گوشـراودا، بەرهەمەکانی تۆبەو کاریگەریی لـە پاکسازیی و چاکسازیی ئینسـاندا بخەینـەروو:

**باسی یەکەم: کاریگەریی تۆبە لەسەر ڕووح و جەسـتە:**

وەك چـۆن گونـاح و سـەرپێچییەکان، کاریگەریـی و بـەدو خراپییـان لەسـەر ئینسـان هەیـە، بـە پێچەوانـەوەش چاکـەو فەرمانبەرییـەکان (الحسـنات والطّاعـات) یش کاریگەریی ئیجابیی و چاکیـان لەسـەر ئینسـان هەیـە، بـە ڕووح و عـەقڵ و جەستەیەوە، خـوای بـەرزو مـەزن لەوبـارەوە فەرموویەتـی:

﴿ مَنْ عَمِلَ صَٰلِحًا مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ وَهُوَ مُؤْمِنٌ فَلَنُحْيِيَنَّهُۥ حَيَوٰةً طَيِّبَةً ۖ وَلَنَجْزِيَنَّهُمْ أَجْرَهُم بِأَحْسَنِ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴾[1].

---

(١) النحل :٩٧.

واتـە: هەرکەسێك لـە نێر یان مـێ، کـردەوەی چـاك بـکات و بڕواداریـش بـێ، ئـەوە بێگومـان لـە ژیانێکـی بەختەوەرانـەی (پـاك و چـاك)دا دەیژیەنیـن و (لـە دوارۆژیشـدا) بەپێـی چاکترینـی ئـەوەی دەیانکـرد، پاداشـتیان دەدەینـەوە.

دیـارە گەڕانـەوە بـۆ لای خـواش، نـەك هـەر کـردەوەی چاکـە، بگـرە سـەرچاوە و بناغـەی کـردەوە چاکەکانـە.

ئنجـا لێـرەدا بـە پەسـەندی دەزانـم کـە یەکێـك لـە کورتـە باسـەکانی کتێبـی: (ڕێـگای صالـح بـوون و بـەرەو خواچـوون) کـە زۆر پەیوەندیـی بـەم مەسـەلەیەوە هەیـە بخوازمـەوە[١].

## پەرێزی چاکە و خراپە لە ژیانی ئینساندا:

عەبدوڵڵای کـوڕی عەببـاس خـوا لـە خـۆی و بابـی ڕازی بـێ، لەبـارەی پەرێـزی چاکـەو خراپـەوە لـە ژیانـی ئینسـاندا گوتوویەتـی: (إن للحسـنة ضيـاءً فـي الوجـه، ونـوراً فــي القلـب، وقـوة فـي البـدن، وسـعة فـي الـرزق، ومحبـة فـي قلـوب الخلـق، وإن للسـيئة سـواداً فـي الوجـه، وظلمـة فـي القلـب، ووَهْنـاً فـي البـدن، ونقصـاً فـي الـرزق، وبغضـة فــي قلـوب الخلـق)[٢].

ئـەم قسـە بەپێزەی (ابـن عبـاس) کـە بـە ئاشـکرا ڕووناکیی بنەماڵـەی پێغەمبەری (صلـى اللـه عليـه وسـلم) پێـوە دیـارە، دە (١٠) یاسـای گرنگـی دەربـارەی کاریگەریـی و شـوێنەواری چاکەکـردن و خراپەکردنـی لـە ژیانـی ئینسـاندا تێـدان، پێنجییـان پەیوەندییـان بـە بەرهەمـی چاکـی چاکەکردنـەوە هەیـە، کـە ئەمانـەن:

---

(١) بڕوانە: لاپەڕە (٥٧، ٥٨) لە چاپی سێیەم، ١٤٢١.

(٢) ئەم قسەیە (ابن القيم) لە (الوابل الصيب)دا هێناویەتی و، لە گەلێك شوێنی دیکەشدا باسکراوە.

١- گەشیی و درەوشاوەیی ڕوو (ضیاء فـي الوجه)، خواش فەرموویـــەتی:

﴿ سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِم مِّنْ أَثَرِ السُّجُودِ ﴾[(١)].

واتە: لە ئەنجامی سەجدە بردنەوە، نیشانەیان لە ڕووەکانیاندایە.

٢- ڕووناکیی دڵ و دەروون (نوراً فـي القلب)، خواش فەرموویەتی:

﴿ أَفَمَن شَرَحَ اللَّهُ صَدْرَهُ لِلْإِسْلَامِ فَهُوَ عَلَىٰ نُورٍ مِّن رَّبِّهِ ﴾[(٢)].

واتە: ئنجا ئایا کەسێك خوا سینەی بۆ ئیسلام گوشاد کردبێ و، لە لایەن پەروەردگاریەوە لەسەر ڕۆشنیایی بێ (وەك بابایەکی سینەتاریکی دڵڕەق وایە؟!).

٣-بەهێزیی جەستە (قوة فـي البدن)، خواش لەسەر زمانی (هُود) -علیه السلام- فەرموویەتی:

﴿ وَيَا قَوْمِ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُوا إِلَيْهِ يُرْسِلِ السَّمَاءَ عَلَيْكُم مِّدْرَارًا وَيَزِدْكُمْ قُوَّةً إِلَىٰ قُوَّتِكُمْ ﴾[(٣)].

واتە: ئەی گەلەکەم! داوای لێبوردن لە پەروەردگارتان بکەن، پاشان بگەڕێنەوە بۆ لای، بارانی بەخوڕزەم و ڕێژنەتان بەسەردا دەبارێنێو، وێڕای هێزی خۆتان، هێزو پێزی دیکەشتان بۆ زیاد دەکات.

٤- فراوانبوونی ڕۆزیی (وسعة فـي الرزق)، خواش فەرموویەتی:

﴿ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا ﴿٢﴾ وَيَرْزُقْهُ مِنْ حَيْثُ لَا يَحْتَسِبُ ﴾[(٤)].

واتە هەرکەسێك پارێزکاریی لە خوا بکات، دەرووی خێری لێ دەکاتەوەو، بێئەوەی چاوەڕوانیی بکات بژیوی دەدات.

---

(١) الفتح :٢٩.

(٢) الزمر :٢٢.

(٣) هود :٥٢.

(٤) الطلاق :٢-٣.

٥- خۆشویستـران لە دڵی خەڵکی دا (ومحبة فـي قلوب الخلق)، خواش فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَعَمِلُواْ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَيَجۡعَلُ لَهُمُ ٱلرَّحۡمَٰنُ وُدّٗا﴾[١].

واتە: بێگومان ئەو کەسانەی ئیمانیان هەیەو کردەوە باشەکان دەکەن، خوا خۆشەویستییان بۆ پەیدا دەکات، لە (دڵی خەڵکیدا).

هەروەها پێنجیشیان باسی پەرێزی شوومی خراپەکردن دەکەن، کە ئەمانەن:

١- ڕەشـیی و تڵخیی دەم وچـاو (سـواداً فـي الوجه)، خواش فەرموویـەتی:

﴿فَأَمَّا ٱلَّذِينَ ٱسۡوَدَّتۡ وُجُوهُهُمۡ أَكَفَرۡتُم بَعۡدَ إِيمَٰنِكُمۡ﴾[٢].

واتـە: ئنجا ئەوانەیـان کـە ڕوویـان ڕەش و تڵخ هەڵگـەڕاوە (پێیـان دەگوتـرێ) ئایا پاش ئیمـان هێنانتـان کافـر بوونـەوە!!

٢- تاریکیی دڵ و دەروون (ظلمة فـي القلب)، خواش -عزّ وجل- دەفەرموێ:

﴿ٱللَّهُ يَسۡتَهۡزِئُ بِهِمۡ وَيَمُدُّهُمۡ فِي طُغۡيَٰنِهِمۡ يَعۡمَهُونَ﴾[٣].

واتـە: خـوا گاڵتـەیـان پێدەکات و جڵەویـان بـۆ شـل دەکات، کـە لـەسـەر کێشـیی خۆیانـدا سەراسـیمە بـن.[٤]

٣- بێ هێزیی لەش (وَوَهْـنـاً فـي البدن)، خواش -سبحانه وتعالـى- فەرموویەتی:

﴿وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾[٥].

---

(١) مريم :٩٦.

(٢) آل عمران:١٠٦.

(٣) البقرة :١٥.

(٤) زانایان گوتوویانە: (العَمَـهُ للبصيـرة، كالعُمْـي للبصـر). سەراسیمەیی بۆ دەروون، وەك کوێریی وایـە بـۆ چـاو.

(٥) الأعراف :١٥٧.

واتە: هەرچییەك كە پیس و زیانبەخشە (لە خواردن و خواردنەوە جل و بەرگ و كەل و پەل و ...هتد)، لێیان قەدەغە دەكات.

٤- كەم و كورتیی بژێو (ونقصاً في الرزق)، خواش -عزّ وجل- فەرموویەتی:

﴿ وَمَنْ أَعْرَضَ عَن ذِكْرِي فَإِنَّ لَهُۥ مَعِيشَةً ضَنكًا ﴾(١).

واتە: هەر كەسێك ڕوو لە بەرنامەی من وەرگێڕێ، بێگومان گیرۆدەی گوزەرانی تەنگ و تاڵ دەبێ.

٥- بوغزێنراویی لە دڵی خەڵكیدا (وبغضةً في قلوب الخلق)، خوای كاربەجێش لەسەر زمانی (لوط) -علیه السلام- فەرموویەتی:

﴿ قَالَ إِنِّي لِعَمَلِكُم مِّنَ ٱلْقَالِينَ ﴾(٢).

واتە: (لوط) بە گەلەكەی خۆی فەرموو: بەڕاستیی من لە ڕق لێبووەوانی كردوەكەتانم.

شایانی باسیشە كە ئێستا بەهۆی بەرەوپێشچوونی زانستی پزیشكگەریی (علم الطِبّ) بە گشتیی و، زانیاریی دەروونزانیی بە تایبەتی، بۆتە شتێكی ڕوون و بێ چەندوچوون، كە هەركام لە ڕووح و جەستە كاریگەریی پتەوو بەتین و ڕاستەوخۆیان لەسەر یەكدی هەیەو، زۆر لە نەخۆشی و دەردە جەستەییەكان، ڕیشەو هۆكارەكەیان دەگەڕێتەوە بۆ ڕووح و دڵ و دەروون و عەقڵ و خوو و خەسڵەت و نەخۆشییە پەنهانییەكان.

دەجا هیچ گومانیش لەوەدا نیە كە ئەنجام دانی هەر گوناح و خراپەیەك، برین و زامێكە كە لە ڕووح و دەروون دەكرێ و، هەر چاكەو خێرێكیش، هەتوان و چارەسەرێكی ئەو برین و زامە مەعنەوییانەیەو، (تۆبە)ش هەنگاوی یەكەم و بەردی بناغەو سەرچاوەی، سەرجەم كردەوە چاك و پەسەندو ڕەفتارو ڕەوشتە بەرزو جوانەكانە.

---

(١) طه:١٢٤.

(٢) الشعراء :١٦٨.

## باسی دووەم: کاریگەریی گەڕانەوە بۆ لای خوا، لەسەر ئیمان و عەقیدەو لە خوا نزیککەوتنەوەی ئینسان:

ئەگەر گوناح و تاوانەکان بە گشتیی، چ چواندنی فەرزان بن، چ توخنکەوتنی سەرپێچییان، چ ئاشکراو دیاربن، وەك قەتڵ و داوێن پیسیی و ڕێگریی و... هتد، چ پەنهان و شێرراوە بن، وەك بوغزو کینەو حەسەدو بەدگومانیی و خۆبەزلگریی و...هتد، نیشانەو بەڵگەی لە خوا دووریی ئینسانن، تاعەت و کردەوە چاکەکانیش بە گشتیی و، بە تایبەت گەڕانەوە بۆ لای خوا، بەڵگەو نیشانەی لە خوا نیزیکیین، بۆیە گەڕانەوە بۆ لای خوا (التوبة إلى الله) کاریگەرییەکی گەورەو گرنگی لەسەر ئیمان و خواناسیی و، گەشەپێکردنی و پتەوو مەحکەم کردنی هەیە.

لە ڕاستییدا وەك چۆن ئیمان و عەقیدە، لە سۆنگەی گوناح و سەرپێچییەکانەوە، کزو لاواز دەبێ و گەرم و گوڕیی و شۆق و ڕووناکیی جوانیی و ڕەونەقی کەم دەبێ و، بگرە جاری واش هەیە هەر نامێنێ و، وەك گوتراوە: (المعاصي بريد الكفر) گوناحەکان پۆستەی کوفرن، بە پێچەوانەشەوە: گەڕانەوە بۆ لای خوا دەبێتە مایەی هێزو پێزی ئیمان و عەقیدەو، گەرم وگوڕ داهێنانی دڵ ودەروون و، وەشۆق هێنانی و، جوانکردن و ڕازاندنەوەی بەهۆی خواناسیی و ئیمانەوە.

بەڵێ لە ڕاستییدا تۆبە مشتومالکاری ئیمان و عەقیدەیە، هەر بۆیەش نەك تەنیا زانایان و پێشەوایان، بگرە پێغەمبەرانی هەڵبژاردەو پایە بەرزی خواش -عليهم الصلاة والسلام- لە ئامادەمەوە تاکو خاتەم، سەرجەم بە خەسڵەتی بەرزی تۆبەکردن و بۆ لای خوا گەڕانەوە، مەدح و ستایش کراون و، خوای لێبوردەو بەخشندە ڕوونی کردۆتەوە، کە تۆبەکردن و بۆ لای خوا گەڕانەوەو داوای لێبوردن لە خوا کردنی ئەو زاتە بەرزو ناوازانە، مایەی پلەو پایە بۆ بەرزکرانەوەو، هەڵبژاردنیان بووە لە لایەن خوای کاربەجێوە، با سەرنجی ئەم چەند ئایەتە بدەین:

١- ﴿ وَعَصَىٰٓ ءَادَمُ رَبَّهُۥ فَغَوَىٰ ﴿١٢١﴾ ثُمَّ ٱجْتَبَٰهُ رَبُّهُۥ فَتَابَ عَلَيْهِ وَهَدَىٰ ﴾(١) .

واتــە: ئـادەم سـەرپێچیی لـە پـەروەردگاری کـردو، لـە ئاکامـدا سـەرگەردان بـوو، پاشـان، پـەروەردگاری هەڵیبـژاردو تۆبـەی لـێ وەرگـرت و ڕێڕوونیـی کـرد.

کەواتـە: لـە ئەنجامـی تۆبەکـردن و داوای لێبـوردن کردنی ئادەمدا -علیه السـلام-، خـوا دووبـارە بـە ڕەحمـەت و بەخششـی خـۆی گەڕاوەتـەوە سـەری و هەڵیبـژاردووەو ڕێڕوونیـی کـردوە! واتـە: هەرچـی بەهـۆی سـەرپێچییەکانەوە دۆڕاندوویەتـی، هەمـووی و بگـرە بـە زیادیشـەوە، بەهـۆی تۆبـەوە تێـی هەڵهێناوەتـەوەو قەرەبـووی کردۆتـەوە.

٢- ﴿ وَظَنَّ دَاوُۥدُ أَنَّمَا فَتَنَّٰهُ فَٱسْتَغْفَرَ رَبَّهُۥ وَخَرَّ رَاكِعًا وَأَنَابَ ﴿٢٤﴾ فَغَفَرْنَا لَهُۥ ذَٰلِكَ ۖ وَإِنَّ لَهُۥ عِندَنَا لَزُلْفَىٰ وَحُسْنَ مَـَٔابٍ ﴾(٢) .

واتـە: داوود زانـی کـە تاقیمـان کردۆتـەوە، بۆیـە داوای لێبوردنـی لـە پـەروەردگاری کـردو گەڕایـەوە، ئنجـا ئێمـەش لـەوە بەخشـیمان و، بێگومـان بـۆ وی لـە لایـەی ئێمـە، پلـەو پایـەی نیزیـك و چاکتریـن جێگاو ڕێگا هەیـە.

بەڵـێ، دواییـش داوود -علیـه السـلام- پـاش گەڕانـەوەو داوای لێبوردنکـردن، خـوای پـەروەردگار نیزیکیـی و پایەبەرزیـی ڕادەگەیەنـێ!

ئنجا هەر لە ئایەتی دوای ئەویشدا فەرموویەتی:

﴿ يَٰدَاوُۥدُ إِنَّا جَعَلْنَٰكَ خَلِيفَةً فِى ٱلْأَرْضِ ﴾(٣) .

واتە: ئەی داوود! ئێمە تۆمان لە زەویدا بە جێنشین داناوە.

---

(١) طه:١٢١- ١٢٢.

(٢) ص :٢٤-٢٢٥.

(٣) ص :٢٦.

٣- ﴿ وَوَهَبۡنَا لِدَاوُۥدَ سُلَيۡمَـٰنَۚ نِعۡمَ ٱلۡعَبۡدُ إِنَّهُۥٓ أَوَّابٌ ﴾[١].

واتە: سولەیمانمان بە داوود بەخشی، کە چاکترین بەندە بوو، چونکە دەگەڕایەوە بۆ لای خوا.

کەواتـە: ئینسـان بەهـۆی گەڕانـەوە بـۆ لای خـواو، هەمیشـە داوای لێبـوردن لێکردنـی، دەچێتـە ڕیـزی بەنـدە پەسـەندەکانی خـواوە، کـە زۆر لێـی نیزیکـن.

٤- {إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللهِ فِي اليَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ}[٢]، واتە: بێگومان تەمی بێئاگایی بەسەر دڵمدا دێ و، من لە ڕۆژێدا سەد جار داوای لێبوردن لە خوای زاڵ و پایە بەرز دەکەم.

وەك دەبينيـن پێغەمبـەری خاتـەم (صلى الله عليه وسلم) بەهـۆی گەڕانـەوە بـۆ لای خـواو، داوای لێبـوردن لـێ کردنیـەوە، تـەم ومـژی جاروبـار بێئاگایـی (غفلـة) لەسـەر دڵ و دەروونـی، هەمیشـە بـە ڕووناکیـی ئیمـان و یـادی خـوا، ڕۆشـن و ئـاوەدان و مشـت و مـاڵ دەکات!



---

(١) ص:٣٠

(٢) أخرجه مسلم: ٢٧٠٢.

**باسی سێیەم: کاریگەریی تۆبە لە ڕووی خواپەرستییەوە:**

گەڕانەوە بۆ لای خوا، کە دڵ و دەروونی ئینسان مشت وماڵ دەکات و ئینسان لە خوای خۆی وە نیزیك دەخات، کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر لایەنی خواپەرستیی (عبادة) هەیەو، دەبێتە مایەی گەرم وگوڕیی ئینسان و چوست و چالاکیی، بۆ بەندایەتیی و پەرستنی چاکترو قووڵتر بۆ خواو، تام و چێژ وەرگرتنی زیاتر.

بەندە بە ئەزموونی تایبەتی خۆم بۆم دەرکەوتوە، لەو کاتانەدا، کە تۆبەی چاکترو قووڵترو جیددییترم کردوەو، باشتر بۆ لای خوا گەڕاومەوەو، بۆ پۆشینی گوناحەکانم و خاوێن کردنەوەو داشۆرینم لە هەڵەکانم لێی پاڕاومەوە، تام و چێژی زیاترو چاکترم لە خوا پەرستییەکان (العبادات)م کردوە.

هۆی ئەو حاڵەتەش ئەوەیە کە دڵ و دەروونی ئینسان لە سۆنگەی گوناح و سەرپێچییەکانەوە، نەخۆش دەبێ و، بەهۆی نەخۆش کەوتنیشەوە، میزاجی تێك دەچێ و، نە جەستەو ڕووحی وەك پێویست توانای ئەنجامدانی خوا پەرستییەکانیان دەبێ و، نە دڵ و دەروونیش تام و چێژیان لێ دەکات! وەك چۆن نەخۆشییە جەستەییەکان، دەبنە هۆی خواردن و خواردنەوە پێ نەخوران و، تام و چێژو سوود لێ وەرنەگرتنی، خواردن و خواردنەوەکان!

خوای پەروەردگاریش لە دیارییکردنی خەسڵەتە سەرەکییەکانی ئەهلی ئیماندا، تۆبەو گەڕانەوە بۆ لای خوای، خستۆتە پێش هەموو خەسڵەتەکانەوە، تەنانەت خواپەرستییش!

﴿ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ...﴾[1].

---

(١) التوبة:١١٢.

**باسی چوارەم: ڕەوشتی بەرز و جوان یەکێکە لە بەرهەمەکانی تۆبە:**

شتێکی ئاشکرایە کە خوای کاربەجێ هەرچی خراپ و شووم و بێ خێرە، لە نیازو مەبەست و قسەو کارو کردەوەو ڕەفتارەکان، قەدەغەی کردووە، خستوویەتە خانەی (حَرَام)ەوە، تەنها ئەو شتانەشی بە پێویست (فرض، واجب) یان پەسەند (مستحبّ) داناون، کە بە مسۆگەریی خێرو قازانج و بەهرەو بەرژەوەندیی جەستەو گیان و تاك و کۆمەڵیان تێدایە، لە دنیاو قیامەت و دوارۆژیشدا، وەك فەرموویەتی:

﴿ ٱلَّذِينَ يَتَّبِعُونَ ٱلرَّسُولَ ٱلنَّبِيَّ ٱلْأُمِّيَّ ٱلَّذِي يَجِدُونَهُۥ مَكْتُوبًا عِندَهُمْ فِي ٱلتَّوْرَىٰةِ وَٱلْإِنجِيلِ يَأْمُرُهُم بِٱلْمَعْرُوفِ وَيَنْهَىٰهُمْ عَنِ ٱلْمُنكَرِ ﴾[١].

واتە: (خوا بەزەیی خۆی تایبەت کردوە) بەو کەسانەوە کە شوێن ڕەوانەکراوی هەواڵ پێدراوی نەخوێندەوار (واتە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)) دەکەون، کە دەیبینن (ناوونیشانی) نووسراوە لە تەورات و ئینجیلی بەردەستیاندا، کە فەرمانیان بە هەرچی چاك و پەسەندە، پێ دەکات و هەرچی خراپ و ناپەسەندە پێشگیرییان لێ دەکات..

دەجا بێگومان هەر کەسێکیش لە سۆنگەی شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەری نەخوێندەوارەوە (صلى الله عليه وسلم) شان بداتە بەر ئەنجامدانی هەرچی چاك و پەسەندە (المعروف) و، توخنی هەرچی بەدو ناپەسەند (المُنكر)ە نەکەوێ، مانای وایە کەم و زۆر ڕەوشت و خووی وەك هی پێغەمبەری ڕەوشت بەرزو مەزن (صلى الله عليه وسلم) دەچێ، کە لە سایەی بەڕێوەچوونی بە گوێرەی قورئانەوە، وەك (عائشة)ی هاوسەری گوتوویەتی: {كَانَ خُلُقُهُ الْقُرْآنَ}[٢]، بوو بوو بە خاوەنی ڕەوشت و خووی مەزن: ﴿ وَإِنَّكَ لَعَلَىٰ خُلُقٍ عَظِيمٍ ﴾[٣].

---

(١) الأعراف :١٥٧.

(٢) أخرجه مسلم: ٧٤٦.

(٣) القلم:٤.

دیـارە دەعـوای مسـوڵمانان بـوون و گـەڕانـەوە بـۆ لای خـواش، لـە هیـچ کـەس ناسـەلمێنرێ، تاکـو شـوێن پێـی پێغەمبـەری خـوا (صلـی اللـه علیـه وسـلم) هەڵنەگـرێ: ﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ ﴾[1]، واتـە: بڵـێ ئەگـەر (ڕاسـتە) خواتـان خۆشـدەوێ، پەیڕەوییـم لـێ بکەن، خواش خۆشـی دەوێن و، لە گوناحەکانیشتان دەبووری و، خوا لێبوردەی بـە بەزەییـە.

## باسی پێنجەم: بەرهەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە ڕووی کۆمەڵایەتییەوە:

هیـچ گومانـی تێدا نیـە کـە بابای بۆ لای خوا گـەڕاوەو، دەست لـە گونـاح و تاوان هەڵگرتـووی پـاك بـووەوە، کـە خـوا موژدەی خۆشویسـتنی خۆی پێداوە:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ يُحِبُّ ٱلتَّوَّٰبِينَ وَيُحِبُّ ٱلْمُتَطَهِّرِينَ ﴾[2].

واتـە: بێگومـان خـوا زۆر تۆبـەکاران و خـۆ پاککەرەوانـی خۆشـدەوێ، بەڵـێ بابـای ئـاوا هـەم بـۆ خـۆی و، هـەم بـۆ خێزان و بنەماڵـەی و، هـەم خزم و دەرو دراوسـێ و هاوشـارو هاووڵاتییانـی، سـوودبەخش و سـەر بـە خێرو جوامێرە.

چونکـە بێگومـان ئـەوەی کـە دەبێتـە هـۆی گەنـدەڵ و پووچـەڵ و کرمۆڵکردنـی میللـەت و کۆمـەڵگاو، نەمانـی هێمنیـی و ئاسـاییش و دڵنیایـی و، بڵاوبوونـەوەی تـرس و لـەرزو بێباوەڕیـی و بەدگومانیـی و دڵەڕاوکـێ و..هتـد، بڵاوبوونـەوەو تەشـەنەکردنی ئـەو گونـاح و تـاوان و خراپەکارییانەیـە، کـە ئیسـلام لـە پێنـاوی پاراسـتنی: دیـن و ژیـان و وەچـەو ئابـڕوو و عـەقڵ و مـاڵ و ئاسـایش (الدیـن والحیـاة والنسـل والعـرض والعقـل والمـال والأمـن)ی کۆمـەڵگادا، چەنـدان جۆرە سزای سـەختی بـۆ دانـاون، کـە پێشـتر باسـمان کـردن.

---

(١) آل عمران:٣١.

(٢) البقرة :٢٢٢.

بەڵێ هەر کۆمەڵگاو میللەتێك، لە سایەی جێبەجێکردنی شەریعەتی خواوە، ئەو حەوت شتەی تێدا پارێزراوبن، کە شەرعزانان بە حەوت شتە پێویستەکان (الضروريات السبع) ناویان بردوون، کە بریتین لە: ئایین و ئابڕوو و ژیان و سامان و وەچەو عەقڵ و ئاساییش، ئەوە بێگومان کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلامەت و تۆکمەو توندو تۆڵ دەبێ، دەجا بێگومان بابای بۆ لای خوا گەڕاوەو بۆ خوا صوڵحاو، بەر لە هەر شتێك لەو گوناح و تاوانە پیس و نەگریسانە دوور دەکەوێتەوە، کە خوا لە دنیاو دوارۆژیشدا، سەختترین سزاو جەزرەبەی بۆ ئەنجامدەرانیان داناوە.

**باسی شەشەم: بەرهەمی تۆبە لە ڕووی جەنگ و جیهادەوە:**

هەرکاتێك ئینسان بە ڕاستیی بەرەو خوا گەڕایەوەو، لەگەڵی ئاشت بۆوەو لێی نزیك بۆوە، خۆی و هەرچی هەیەتی، بە سەخاوەتەوە لە پێناویدا بەخت دەکات و دەبەخشێ، چونکە بە ڕاستیی سەنگەری پێشەوە (الخندق الأمامي)ی شەیتان بۆ شەڕ لەگەڵکردن و زەفەر پێبردنی مرۆڤ، نەفسیەتی، هەرکاتێك ئینسان لە خودی خۆیدا لە بەرانبەر شەیتاندا شکستی خوارد، لە هیچ سەنگەرو بەرە (جبهة)یەکی دیکەدا خۆی ناگرێتەوە!

هەروەها بە پێچەوانەشەوە هەر ڕاستەو، هەرکاتێك ئینسان لە جوغزی نەفسیدا بە شەیتان وێرا، مەگەر چۆن، دەنا شەیتان جارێکی دیکە خۆی بۆ ناگرێتەوە.

ئنجا ئاشکرایە کە تۆبەو بۆ لای خوا بادانەوەو، ڕوو بە چاکەو تاعەت گەڕانەوە، خاڵی وەرچەرخان (نقطة إنعطاف)ی ئینسانە، بۆ دژایەتییکردنی شەیتان و زەفەر پێبردنی و پشت لە زەوی دانی، چ شەیتانی جندو، چ هی مرۆڤ، هەر بۆیەش خوای باڵادەست فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ ٱشۡتَرَىٰ مِنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ أَنفُسَهُمۡ وَأَمۡوَٰلَهُم بِأَنَّ لَهُمُ ٱلۡجَنَّةَۚ يُقَٰتِلُونَ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ فَيَقۡتُلُونَ وَيُقۡتَلُونَۖ وَعۡدًا عَلَيۡهِ حَقّٗا فِي ٱلتَّوۡرَىٰةِ وَٱلۡإِنجِيلِ وَٱلۡقُرۡءَانِۚ وَمَنۡ أَوۡفَىٰ بِعَهۡدِهِۦ مِنَ ٱللَّهِۚ فَٱسۡتَبۡشِرُواْ بِبَيۡعِكُمُ ٱلَّذِي

بَايَعۡتُم بِهِۦۚ وَذَٰلِكَ هُوَ ٱلۡفَوۡزُ ٱلۡعَظِيمُ ﴿١١١﴾ ٱلتَّٰٓئِبُونَ ٱلۡعَٰبِدُونَ ٱلۡحَٰمِدُونَ ٱلسَّٰٓئِحُونَ ٱلرَّٰكِعُونَ ٱلسَّٰجِدُونَ ٱلۡأٓمِرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَٱلنَّاهُونَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡحَٰفِظُونَ لِحُدُودِ ٱللَّهِۗ وَبَشِّرِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ ﴾[١].

واتـە: بێگومـان خـوا، گیـان و سـامانی لـە بڕواداران کڕیوە کـە بـە هەشتیان بداتـێ، لـە ڕێـی خـوادا دەجەنگـن دەکـوژن و دەکوژرێـن، (ئـەوە) بەڵێنێکـی ڕاستە کـە لـە تـەورات و ئینجیـل و قورئانـدا داویەتـی، ئنجا ئایا کـێ بـە بەڵێنی خۆی وەفادارتـرە لـە خـوا؟ کەواتـە شـادمان بـن بـەو سـەودایەی کـە پەیمانتـان لەسـەری داوەو، هـەر ئەوەشـە بـە مـراد گەیشـتنی مـەزن، (بڕوادارانێکیـش ئـەو بەڵێنەیـان پـێ دەبڕێتـە سـەر کـە) تۆبـەکاران، خواپەرستان، ستایشـی خواکـەران، ڕۆژووگـران، ڕکووع بـەران، سـەجدە بـەران، فەرمـان بـە چاکـە کـەران و، ڕێ لـە خراپـە گـران و، پارێزەرانـی سـنوورەکانی خـوان و، مـوژدەش بـدە بـە بڕوادارانێـك (کـە خاوەنـی ئـەو خەسـڵەتانەن بـە سـەرخستنی خـوا، بۆیـان و بـە مـراد گەیاندنیـان).

وەك دەبینیـن خـوای زانـای پەنهـان و ئاشـکرا، یەکەمیـن خەسـڵەتی بنچینەیـی و گرنگـی، ئـەو کەسـانەی کـە ئامـادەن خۆیـان بـۆ خـوا فیدا بکـەن و سـەروماڵیان بەخت بکـەن، بـە گەڕانـەوە بـۆ لای خـوا (التوبـة إلـى الله) دانـاوە! جێـی سـەرنج ئەوەیـە کـە نۆیەمیـن خەسـڵەتیان (واتـە موجاهیـدان و جەنگاوەرانـی ڕێـی خـوا) بریتیـە لـە پاراسـتنی سـنوورەکانی خـوا (حفـظ حدود الله)! واتـە: تەنیـا کەسـانێك شایسـتەیی و توانـای ئەوەیـان هەیـە، کـە سـنوورەکانی ئاییـن و بەرنامـەی خـوا پارێزگاریـی لـێ بکـەن، کـە بـەر لـە هەرشـتێك بەهـۆی گەڕانـەوە بـۆ لای خـواو، دەسـت هەڵگرتـن لـە هەڵـەو ناشـەرعییەکانەوە، توانیبیـان سـنوورەکانی ئاییـن و شـەرعی خـوا لـە جوغـزی خۆیانـدا بپارێـزن، ئەگەرنـا بـەردی گـەورە نیشـانەی نەوەشـاندنە (مـن لم يكـن لنفسـه فكيـف يكـون لغيــره!!)، کەسـێك بـۆ خـۆی خێرنەداتـەوە، بـۆ خەڵکیـش سـوودی نابـێ.

---

(١) التوبة :١١١-١١٢.

## باسی حەوتەم: بەرهەمی گەڕانەوە بۆ لای خوا، لە ڕووی سیاسیی و مشوور لێخواردنی مسولْمانانەوە:

بەرەكەت و بەرهەمێكی دیكەی لەگەڵ خوا ئاشتبوونەوەی ئینسان و بۆلا گەڕانەوەی، بریتیە لەوە كە بابای تۆبەكار دوای ئەوەی بەهۆی تۆبەوە، خۆی پاك و چاك دەكات و، گوناح و ناشەرعییەكان لە خۆی دوور دەخاتەوەو، بە فەرمانبەریی (طاعة)و چاكەكان خۆی جوان دەكات و دەڕازێنێتەوە، یەكسەر دەكەوێتە بیرو ئەندێشەی پاكسازیی و چاكسازیی دەوروبەرو میللەت و وڵاتی، تاكو ئەو گۆڕانكاریی (تغییر)ەی كە بەسەر خۆیدا هێناویەتی، بەسەر خەڵك و وڵاتیشیدا ئەنجامی بدات، دیارە هەمیشەش خۆ گۆڕین بناغەی خەڵك گۆڕینە، وەك خوای پەروەردگار فەرموویەتی:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوۡمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُواْ مَا بِأَنفُسِهِمۡۗ﴾[1].

واتە: بێگومان خوا حاڵەت و واقیعی هیچ كۆمەڵێك ناگۆڕێ، تاكو ئەوان حاڵەتی دەروونیی خۆیان نەگۆڕن.

بەڵێ هەركاتێك ئینسان بۆ لای خوا گەڕایەوەو، خۆی لە خڵتەو خاڵ و ژەنگ وژاری هەڵەو پەڵەو ناشەرعییەكان بژاركردو، هەستی بە پاكبوونەوەی خۆی كرد، دەستبەجێ دەكەوێتە بیرو هەوڵی بژاركردنی خەڵك و كۆمەڵگای دەوروبەریشی، تاكو دەوروبەرەكەیشی، وەك خۆی لێ بكات و، شتێكی نامۆ (غریب) نەبێ لەو كۆمەڵگاو واقیعەدا.

هەر بۆیەشە كە دەبینین لە ڕابردوواو ئێستاش، ئەهلی كوفرو خراپەو تاوان، هەرگیز چاویان بەخەڵكی بۆ لای خوا گەڕاوەی پاك وچاك، هەڵنەهاتووە، دانوویان لەگەڵیان نەكوڵیوە، چونكە زانیویانەو دەزانن كە ئایین و شەریعەتی

---

(١) الرعد:١١.

خوا، له شوێنكەوتووەكانی خۆی داوا دەكات: ئەو هەق و چاكیی و پاكییەی خۆیان پەییان پێی بردوەو دەستیان لێی گیربووە، لە خۆیاندا كورتی هەڵنەهێنن و، بێ درەنگ بە خەڵك و میللەتیشیانی بگەیەنن و، كۆمەڵگاو وڵاتی پێبڕازێننەوە!

سەرنج بدە! چۆن گەلی (لوط) -علیه الصلاه والسلام- كە كۆمەڵێكی پیس و پەست و نەگریس بوون، بە (لوط)و ئەو دەستەیەی كە ئیمانیان پێ هێناوە، بۆ لای خوا گەڕاونەوە، دەڵێن:

﴿أَخۡرِجُوهُم مِّن قَرۡيَتِكُمۡۖ إِنَّهُمۡ أُنَاسٞ يَتَطَهَّرُونَ﴾(١).

واتە: لە ئاوەدانیی خۆتان وەدەریانبنێن، چونكە ئەوانە كەسانێكن خۆیان پاكسازیی دەكەن!

بەڵێ گەلی ڕەوشت نزمی (لوط) -علیه السلام-، زانیویانە كە (لوط)و كۆمەڵە براوادارو بۆلای خوا گەڕاوەكەی دەوری، پاش قۆناغی خۆ پاكسازیی كردن، دەگەنە قۆناغی پاكسازیی و چاكسازیی كۆمەڵگاكەشیان و، سەرەنجام ئەوان (گەلە سەرگەردان و ڕەوشت پەستەكە) ژیان و گوزەرانی نەفامانەو پیس و پەستیان لێ تێكدەچێ، كە وەك چۆن قالۆنچە هۆگری تام و بۆنی ڕیخ و تەرس بووەو، بە بۆنی عەترو گوڵاو گێژ دەبێ، ئەوانیش هۆگری ئەو جۆرە ژیان و گوزەرانە ئاژەڵیی و، بگرە لە ئاژەڵییش خراپترو نزمترە بوون!!

بەڵێ ئەمەیە هۆكار بنەڕەتیی دژایەتیی كردن و بەرەنگار بوونەوەی حیزب و ڕژێم و كۆمەڵگا نەفامییەكان (الأحزاب والأنظمة والمجتمعات الجاهلية)، لەگەڵ ئەو گەنج و لاوە هیدایەت دراوو بۆ لای خوا گەڕاوەو پاك و چاكانەدا، كە بە تەئكید چاویان بەرینایی نادات، لە خەڵك و كۆمەڵگای سەرگەردان و پیس و پۆخڵیان ڕابمێنن و، دەستە پاچەنە دەست لە ئەژنۆیان وەربێنن و، تەنیا بەوەندە وازبێنن كە زیكری: (لا حول ولا قوة إلا بالله) بخوێنن!

---

(١) الأعراف :٨٢.

شایانی باسیشە:

مەبەست لـە كۆمەڵگای نەفامیی (المجتمـع الجاهـلي) هـەر كۆمەڵگایەكـە، كـە یەكێك یـان زیاتـر لـە خەسڵەت و بۆچـوون و ڕەفتـارو هەڵسـوكەوتە پێچەوانـەی شـەرعییەكانی تێدابن، ئیدی مـەرج نیـە كـە حەتـمەن كافرو لـە ئایین دەرچووبێ، هـەر بۆیـەش خـوای بـەرزو مـەزن هـەركام لـە: بەرنامـەی حوكمڕانیی (الحكم)و، گومانـی خـراپ بـە خـوا بـردن (الظـن الـسيء باللـه)و، جوانیـی و عەوڕەتـی خۆ دەرخسـتنی ئافرەتان و، (تبـرج النساء)و، دەمارگیریی و دڵگەرم بوونی بە ناهەق (الـحَمِيَّة)ی، بەهی نافامێتیی (جاهـلي) ناوبـردوون:

أ- ﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ... ﴾المائدة:٥٠.

ب- ﴿ ...يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ... ﴾آل عمران:١٥٤.

جـ- ﴿ ...وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ... ﴾الأحزاب :٣٣

د- ﴿ إِذْ جَعَلَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ فِى قُلُوبِهِمُ ٱلْحَمِيَّةَ حَمِيَّةَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ ... ﴾الفتح:٢٦.

كەواتـە: هـەر كام لـە حوكـم و بەرنامـەو، هەسـت و نەسـت و بیـروبۆچوون و، عـادەت و نەریت و، ڕەوشـت و ڕەفتـاری، ناشـەرعییانەو دژو پێچـەوانەی هـەق، بـە چەند حاڵـەت و دیاردەیەكی نەفامانـەو هەڵقوڵاوی واقیعێكی نەفامێتیی (جاهلیـة) دادەنرێن، هەرچەندە خەڵكەكەش هەمـوو جارێ، یـان هەموویـان كافر نەبن!

خوێنەری بەڕێزو شیرین!

لێرەشدا كۆتایی بـەم بەشی حەوتەمـە دێنیـن، كـە تەرخانمان كردبوو بۆ باس و توێژنـەوەی كاریگەریی و شـوێنەوارو بەرهەمـی گەڕانـەوە بۆ لای خوا، لـە سڕینەوەی گونـاح و چاككردنـی ئینسـاندا.

دیـارە ئـەم باسـەش گەورەترین باسـی بابـەت (موضـوع)ی تۆبـە بـووو، بێگومـان بەرهەم و شـوێنەوارەكانی تۆبەش سـەنگی مەحەكینی و، بەڵگەو نیشـانەی جەوهەرو

نێوەڕۆكینـی، چونكـە وەك گوتـراوە: درەخـت بـە بەرەكـەی دەناسـرێ (الشـجرة بثمرهـا)، ئنجـا پـاش ئاڕاسـتەكردنی (دوا قسـەم) كۆتایـی بـەم كتێبـە دێنیـن.

**دوا قسـەم:**

خوێنەرە بەڕێزو خۆشەویستەكانم!

دوا قسـەم كـە عـەرزتـان بكـەم لـە بارەی تۆبـەو گـەڕانـەوە بـۆ لای خـواوە، ئـەوەیـە كـە هیـچ كامتـان هیـچ كاتێك پێـی وانـەبێ: پێویسـتیی بـە تۆبـە نیـە و لێـی بێنیـازە! بەڵكـو هەمـوو ئینسـانێك لـە هـەر پلەیـەكی ئیمـان و مسـوڵمانەتییدا بێ و، لـە هـەر قۆنـاغ و هـەل ومەرجێكی دینداریـیدا بێ، بـەردەوام پێویسـتیی بـە گـەڕانـەوە بـۆ لای خـوا هـەر هەیـەو، هیـچ كاتێك لـە هیـچ حـاڵ و هـەل ومەرجێكـدا، لێـی بێنیـاز نابێ، بەڵگەشـم ئـەوەیـە كـە پێغەمبەرانـی هەڵبـژاردەو پـاك و پایەبـەرزی خـوای لێبـوردەو بـە بەزەیـی، لـە ئادەمـەوە هەتـا خاتـەم، -علیهـم أفضـل الصلـوات وأتـم التسـلیمات-، بـەردەوام سـەرگەرمی گـەڕانـەوە بـۆ لای خـواو، داوای لێبـوردن لێكردنـی بـوون، بـۆ وێنـە: ئـەوەتـا گـەورەو سـەروەری پێغەمبـەران موحەممـەدی كـوڕی عەبدوڵڵا-علیه من الصـلاة أدومهـا ومـن التسـلیمات أكملهـا-، خـوای پـەروەردگار لـە كاتـی گرتنـی شـاری مەككـەو ڕزگاركردنـی لـە چنگاڵـی شـیرك و كوفـردا، فەرمانـی پێكـردوە، كـە بـە پاكی بگرێ و ستایشـی بكات و، داوای لێبوردنی لـێ بكات و بگەڕێتەوە بۆ لای!

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿إِذَا جَآءَ نَصْرُ ٱللَّهِ وَٱلْفَتْحُ ۝١ وَرَأَيْتَ ٱلنَّاسَ يَدْخُلُونَ فِى دِينِ ٱللَّهِ أَفْوَاجًا ۝٢ فَسَبِّحْ بِحَمْدِ رَبِّكَ وَٱسْتَغْفِرْهُ ۚ إِنَّهُۥ كَانَ تَوَّابًۢا﴾[1].

واتـە: بەنـاوی خـوای بـە بەزەیـی بەخشـندە، كاتێك یارمەتـی خـوا هـات و (شـاری مەككـە) ئازادیـی بـۆ هـات و، خەڵكـت دی كۆمـەڵ كۆمـەڵ دەهاتنـە نێـو ئاییـنی

---

(١) النصر:١-٣ .

خواوە، بە ستایشکردنەوە پەروەردگارت لە هەر هەڵەو پەڵەیەك بە دوور بگرەو، داوای لێبوردنی لێبکە، چونکە بێگومان ئەو زۆر گەڕاوەیە (بۆ سەر بەندەکانی بە بەزەیی و بەخششەوە).

هەروەها لە فەرمووده ڕاست (صحیح)ەکاندا هاتوە کە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) پاش تەواوکردنی نوێژی فەرزو سەلام دانەوەی سێ جاران دەیفەرموو: {أَسْتَغْفِرُ اللَّهَ}[1] داوای لێبوردن لە خوا دەکەم..

ئنجا با سەرنج بدەین و ڕامێنین! ئایا ئەگەر پێغەمبەرێکی وەك (محمد المصطفى) کە گەورەو سەروەری وەچەی ئادەمە: {عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَنَا سَيِّدُ وَلَدِ آدَمَ}[2]، لە دوای ئەنجامدانی دوو خواپەرستیی گەورەی وەك: ئازادکردنی مەککە، کە گەورەترین قەڵای شیرك و کوفر بووە، لە نیوە دورگەی عەرەبییداو، نوێژ بەرپاکردن، کە گەورەترین جۆرە خواپەرستیی تایبەتییە، پێویست و پەسند بێ، بگەڕێتەوە بۆ لای خواو، داوای لێبوردنی لێ بکات، دەبێ ئێمەومانان کە فەرمانبەریی و چاکەکانیشمان لەچاو هی پێغەمبەری کۆتایی (صلی الله علیه وسلم) وەك گوناح و سەرپێچیی وان، چ جای گوناح و هەڵەو پەڵە زۆرو زەوەندەکانمان، چەندە حەوجێی تۆبەی بەردەوام و، داوای لێبوردن لە خوا کردنی پەیتا پەیتا بین؟!

بەڵێ تۆبەو داوای لێبوردن لە خواکردن، پاككەرەوەو مشت ومالکاری دڵ و دەروونەو، تەنانەت پێغەمبەری کۆتایی (النبي الخاتم)یش (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی: {إِنَّهُ لَيُغَانُ عَلَى قَلْبِي، وَإِنِّي لَأَسْتَغْفِرُ اللهِ فِي الْيَوْمِ مِائَةَ مَرَّةٍ}[3]، واتە: بێگومان تەمی بێئاگایی بەسەر دڵمدا دێ و، من لە ڕۆژێدا سەد جار داوای لێبوردن لە خوای زاڵ و پایە بەرز دەکەم.

---

(١) أخرجه مسلم: ٥٩١.

(٢) أخرجه مسلم: ٢٢٧٨، وأبو داود: ٤٦٧٣.

(٣) أخرجه مسلم: ٢٧٠٢.

کەواتە: گەڕانەوە بۆ لای خوا (التوبة إلى الله) هیچ کەس لێی بێنیاز نیە.

زانای پایەبەرزیش (عبدالقادر الگیلاني) خوا لێی خۆشبێ لەوبارەوە چەند قسەیەکی جوانی کردوون، کە دەیانکەینە (مسك الختام) ئەم دوا قسەیەمان:

(التوبة فرض عين في حق كل شخص، ولا يتصور أن يستغني عنها أحدٌ من البشر، لأنَّه إن خلا عن معصية الجوارح، فلا يخلو عن الهَمِّ بالذنب بالقلب، وإن خلا، فلا يخلو عن وسواس الشيطان، بإيراد الخواطر المُتَفَرِّقَة المُذْهلة عن ذكر الله عز وجل، فإن خلا، فلا يخلو عن غفلة وقصور في العلم بالله وبصفاته وأفعاله، فلكل حال طاعات وذنوب وحدود وشروط، فحفظها طاعة، وتركها معصية، والغفلة عنها ذنب، فيحتاج إلى توبة وهي الرجوع عن التعويج الذي وجِد إلى سَنَنِ الطريق المستقيم الذي شُرع له. فالكلُّ مفتقرٌ إلى التوبة، وإنما يتفاوتون في المقادير، فتوبة العوام من الذنوب، وتوبة الخواص من الغفلة، وتوبة خواص الخواص من ركون القلب إلى سوى الله عز وجل..)[1].

واتە: {تۆبەکردن پێویستییەکی تایبەتییە لەسەر هەموو کەسێك و، ناگونجێ کە هیچ ئینسانێك لێی بێنیاز بێ، چونکە (ئینسان) ئەگەر سەرپێچیی ئەندامە ڕواڵەتییەکانیشی نەبێ، لە مەبەستی گوناح لە دڵ گرتن خاڵیی نابێ، ئەگەر ئەوەش نەبێ، لە خوتخوتەی شەیتان قوتار هەر نابێ، کە خەیاڵی پرژو بڵاوی لە یادی خوای زاڵ و پایە بەرز بێئاگا کەری بەسەردا دێنێ، ئەگەر لەوەش خاڵیی بێ، لە بێ ئاگایی و کەم و کووڕیی لە بارەی زانیاریی بە خواو بە سیفەتەکانی و کردەوەکانی، هەر بە دوور نابێ، چونکە هەر حاڵەتێك چەند جۆرە خواپەرستییەك و، چەند جۆرە گوناحێك و، چەند سنوورو مەرجیکی هەن، کە پاراستنیان فەرمانبەرییەو، چواندنیان سەرپێچییەو، لێ بێئاگابوونیان گوناحە! کەواتە: پێویستیی بە تۆبە هەیە، کە بریتیە لە گەڕانەوەو دەست

---

(١) بڕوانە: (الآداب الشرعية والحقوق المرعية) لابن المفلح المقدسي، ج١، ص ١٦٣، کە لە: (الغُـنْية لطالِبِي طريق الحـق)ی (عبدالقادر الگيلاني)یەوە هێناویەتی.

هەڵگرتـن لـەو لاربـوون و لادانـەی کـە لـە ڕۆشـتندا بـەرەو ڕاسـتە شـەقامێك کـە بۆی دیاریـی کـراوە، پەیـدا بـووە.

مـادام وابـێ هەموویـان هـەر ئاتاجـی گەڕانـەوە بـۆ لای خـوان، بـەڵام لـە شـێوەو ئەنـدازەدا جیاجیـان:

گەڕانـەوەی خەڵکـی گشـتیی، دەسـت هەڵگرتنیانـە لـە گوناحـەکان و، گەڕانـەوەی خەڵکـی تایبەتیـی، پەشـێمانیی و وازهێنانیانـە لـە لەخـوا بـێ ئاگابـوون، بـەڵام بـۆ لای خـوا گەڕانـەوەی بەنـدە تایبەتـی تایبەتییـەکان (خـواص الخـواص)، بریتیـە لـە پەشـێمانیی و داوای لێبـوردن کردنیـان، لـە دڵ بـەرەو غەیـری خـوا باڵادەسـت و پایـە بـەرز چـوون}!

سـا خوایـە! بەنـاوە هـەرە چاکەکانـت و، صیفەتـە هـەرە بەرزەکانـت، لێـت دەپاڕێینـەوە کـە هیدایەتمـان بـدەی بـۆ تۆبەیەکـی ڕاسـت و سـاغ، کـە لـە چڵـك و چەپـەری گونـاح و هەڵەکانمـان پاکمـان بکاتـەوەو، بـەرەو بەندایەتیـی چاکتـرو زیاتـر بـۆ تـۆ، نیزیکمـان بخاتـەوەو، بـەرەو مەنزڵگای دواڕۆژ بامـان بداتـەوەو، لـە ڕیـزی دوژمنـان و ناحەزانـی کافـرو دەغـەڵ و یاخیـی و لاڕێ و گوناحبـاران، جیامـان بکاتـەوەو، لـە نێـوان کۆمەڵـی پێغەمبـەران علیهـم الصـلاة والسـلام و ئیمـان پتـەوان و شـەهیدان و چاکانـدا، جێمـان بـۆ بکاتـەوە، ئامیـن.

٢٢ محرم ١٤٢٢ ك- ٢٠٠١/٤/١٦ ز

هەورامان- ئەحمەد ئاوا

*****

پێداچوونەوەی بۆ چاپی چوارەم

٢٨ی جەمادی دووەمی

١٤٣١ك- ٢٠١٠/٦/١١ز

هەولێر

*****

پێداچوونەوەی بۆ چاپی پێنجەم

(٥)ی ذي القعدة ١٤٣١ك

(١٣)ی تشرینی یەکەمی٢٠١٠ز

هەولێر

*****

پێداچوونەوەی بۆ چاپی شەشەم

١١/٤/ ١٤٤٢ك

٢٠٢٠/١١/٢٦ز

هەولێر

## بەرهەمەکانی دانەر

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | أ / کتێبە کوردییەکان | | |
| | قـورئـان و سـونـنـەت | | |
| ١ | پوختەیەك دەربارەی ئیسـلام لەبەر ڕۆشنایی سـورەتی فاتیحەدا | چاپی یەك/١٩٨٤<br>چاپی دوو/٢٠٠٦ | |
| ٢ | با لە خزمەت قورئاندا بین، {کۆی هەردووك کتێبی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟) و (ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان)ە} | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | |
| ٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یەکەم: سوورەتەکانی: (الفاتحة) و (البقرة) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٤ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دووەم : سـوورەتی: (آل عمران) | چاپی یەك/٢٠١٢ | |
| ٥ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێیەم: سـوورەتی: (النسـاء) | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٦ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چوارەم: سـوورەتی: (الـمائدة) | چاپی یەك/٢٠١٤ | |
| ٧ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پێنجەم: سـوورەتی: (الأنعـام) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٨ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی شەشەم : سـوورەتی: (الأعـراف) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ٩ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی حەوتەم: سوورەتی: (الأنفال) | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| ١٠ | تەفسـیـری قورئانی بەرزو بەپێـز، بەرگی هەشتەم: سوورەتی: (التوبة) | چاپی یەك/٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١١ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی نۆیەم: سوورەتی: (یونس) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٢ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دەیەم: سوورەتی: (هود) | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ١٣ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی یازدەیەم: سوورەتی: (یوسف) | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١٤ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی دوازدەیەم: سوورەتەکانی: (الرعد، إبراهیم، الحجر) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی سێزدەم: سوورەتی: (النحل) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٦ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی چواردەم: سوورەتی: (الإسرا) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٧ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی پازدەم: سوورەتەکانی: (الکهف، مریم) | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| ١٨ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز، بەرگی شازدەم: سوورەتەکانی: (طه، الأنبیاء) | | |
| ١٩ | شوێنکەوتنی سوننەتی پێغەمبەر ﷺ لەنێوان کەمتەرخەمیی و زێدەڕۆییدا | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ٢٠ | ڕێبازی پێغەمبەری خوا: پێناسە و گرنگیی و پێویستیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| | **بیروبڕواو فیکری ئیسلامیی** | | |
| ٢١ | دەبەرێك ڕاچوونی ئیسلام و ڕێچکان | چاپی یەك/١٩٨٥<br>چاپی سێ/٢٠٠٦ | |
| ٢٢ | ڕێبازی پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) کامەیە ؟! | چاپی یەك/١٩٨٩ | دواتر خرایە نێو کتێبی (مسوڵمانی کامڵ: بەشی یەکەم: بیروباوەڕی مسوڵمان) |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٢٣ | پرۆژەی بەرنامەی پەروەردەو فێرکردنی ئیسلامییانە | چاپی یەك/١٩٩٥ | دواتر خرایە نێو کتێبی: (پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی) |
| ٢٤ | پرۆژەی بەرنامەی فیکریی کاری ئیسلامیی | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ٢٥ | بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی چوار/٢٠١٤ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبییش |
| ٢٦ | چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم، سەرنجێکی واقیعیانەوهەڵسەنگاندنێکی شەرعییانە | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی شەش/٢٠١٦ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی و تورکیی و فارسییش |
| ٢٧ | خواناسیی، ئایین، ئیمان (درەوشاوەیی ئیسلام و پووچەڵیی ئیلحاد) | چاپی یەك/٢٠٠٢<br>چاپی سێ/٢٠٢٠ | |
| ٢٨ | ناوەهەرەجوانەکانی خوا "سبحانه وتعالى" | چاپی یەك /٢٠١٣ | |
| | مەوسووعەی : ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا، (٦ بەرگ) | | چاپی یەك/٢٠٠٦-٢٠٠٨<br>چاپی دوو/٢٠١٦ |
| ٢٩ | بەرگی یەکەم: ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی چیەو چۆنە؟ | | |
| ٣٠ | بەرگی دووەم: خوا بەیەکگرتن لە بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتییدا | | |
| ٣١ | بەرگی سێیەم: خوا بەیەکگرتن لە ناو و سیفەت و لەپەرستراوێتییدا | | |
| ٣٢ | بەرگی: چوارەم: ئیمان بە: فریشتەکانی خوا، کتێبەکانی خوا، پێغەمبەرانی خوا | | |
| ٣٣ | بەرگی پێنجەم: ئیمان بە: ڕۆژی دوایی و قەزاو قەدەر | | - |
| ٣٤ | بەرگی شەشەم: تایبەتمەندیی و دیدوبۆچوونەکانی پەیرەوانی ڕێبازی ڕاست | | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٣٥ | مسـوڵمـانـی کامـڵ: بەشـی یەکەم: بیـروباوەڕی مسـوڵـمان | چـاپی یەك/١٩٩٧ | دواتر خرایە نێو کتێبی (ئیمان و عەقیدەی ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا) |
| ٣٦ | تەوژمی ئیسلامیی و عەلمانیی و خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان | چاپی یەك/٢٠٠٨<br>چـاپی سێ/٢٠١٥ | زۆربەی بە (٢٤) ئاڵقـە لەهەفتەنـامەی (هـاوولاتیی)و، ئەوەی دیکەش بە (٩) ئاڵقە لە هەفتەنامەی(ئاوێنە)دا بڵاوکراوەتەوە |
| ٣٧ | ڕوونکردنەوەی بنەما شەرعییەکان و هێڵە گشتییەکانی کۆمەڵی ئیسـلامیی | چاپی یەك/٢٠١٢<br>چاپی سێ/٢٠١٤ | |
| ٣٨ | تەرجەمەی کوردیی عەقیدەی طەحاویی | چاپی دوو/٢٠١٧ | |
| ٣٩ | ڕوونکردنەوەی عەقیدەی طەحـــاویی | چاپی یەك/ ٢٠١٥ | |
| ٤٠ | سیکۆلاریزم و دیموکراسیی لە ئەزموونی کوردستاندا (دیبەیتی ساڵ) | چاپی یەك/٢٠١٦ | وەرگێردراوە بۆ زمانی عەرەبی و، شێوەزاری کرمانجیی |
| ٤١ | درەوشاوەیی ئیمان و پووچەڵیی ئیلحاد، لەبەر ڕۆشنایی زگماك و عەقڵ و زانست و وەحییدا | چاپی یەك/٢٠١٩<br>چاپی دوو/٢٠٢٠ | |
| | مەوسووعەی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی لەنێوان وەحیی و واقیعدا | | |
| ٤٢ | کتێبی یەکەم: پێناسەو چییەت و سەر گوزشتەو سەرچاوەکان و گرنگیی: بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٨ | - |
| ٤٣ | کتێبی دووەم: هێڵە گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | - |
| ٤٤ | کتێبی سێیەم: تەوژمە سەرەکییەکانی مێژووی مسوڵمانان | چاپی یەك/٢٠١٨ | |
| ٤٥ | کتێبی چوارەم: پایەکانی بیرکردنەوەی ئیسلامیی | چاپی یەك/٢٠١٩ | - |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٤٦ | کتێبی پێنجەم: چەند پرسێکی فیکریی هەنووکەیی جۆراوجۆر | چاپی یەك/٢٠١٩ | ـ |
| | زنجیرەی: باچاکتر ئیسلام بناسین! | ـئەم سێ ئاڵقەیە: دوایی خرانە نێو مەوسووعەی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)یەوە | |
| ٤٧ | ئاڵقەی یەکەم: سەلماندنی بوونی خوا | چاپی یەك/١٩٨٨ | ـ |
| ٤٨ | ئاڵقەی دووەم: پێغەمبەران "علیهم الصلاە والسلام" | چاپی یەك/١٩٨٩<br>چاپی دوو/١٩٩٠ | ـ |
| ٤٩ | ئاڵقەی سێیەم: ڕۆژی دوایی | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| ٥٠ | ئاڵقەی چوارەم: ئایین | ـ | دوایی خرایە نێو کتێبی: (خواناسیی، ئایین، ئیمان) |
| ٥١ | بیررو بڕوا | چاپی یەك/١٩٩٠ | |
| | فیقهی ئیسلامیی | | |
| | مەوسووعەی: خواپەرستیی ئیسلامیی (٤ بەرگ) | چاپی یەك/٢٠٠٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٩ | |
| ٥٢ | بەرگی یەکەم: خواپەرستیی بەگشتیی، وردە بابەتە خیلافییەکان، پاك و خاوێنیی | | |
| ٥٣ | بەرگی دووەم: نوێژ بەرپاکردن یەکەمین درووشمی خواپەرستیی | | |
| ٥٤ | بەرگی سێیەم: زەکات و ماڵ بەخشین | | |
| ٥٥ | بەرگی چوارەم: ڕۆژو گرتن، حەج و عومرەکردن، زیکری خواکردن | | |
| ٥٦ | بنچینە گرنگەکانی هەڵسـ وکەوتی شەرعییانەو ژیرانە لەگەڵ وردە بابەتە خیلافییەکاندا | چاپی یەك/١٩٩٩ | بۆ زمانی عەرەبیش وەرگێڕراوە |
| ٥٧ | جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك | چاپی یەك/٢٠١٣ | |
| ٥٨ | چەند بابەتێکی هونەریی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٥ | بۆ زمانی فارسییش تەرجەمە کراوە |

| تێبینی | بەروارو چاپ | کتێبەکان | ژ |
|---|---|---|---|
| | چاپی یەك/٢٠١٣ | چەند بنەمایەکی گرنگی ماڵ و سامان بەخشین لەڕێی خوادا | ٥٩ |
| | | تەزکیـەی نەفس و ڕەوشت و ئاكار | |
| | چاپی یەك/١٩٨٧ | یادی خوا، گرنگیی یادی خوا لە ژیانی مرۆڤدا | ٦٠ |
| وەرگێڕدراوە بۆ زمانی عەرەبی و فارسییش | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی پێنج/٢٠١٢ | ڕێگای صاڵح بوون و بەرەو خوا چوون، تەزکیەی نەفس لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەتدا | ٦١ |
| | چاپی یەك/١٩٩٨ | تەزکیەو تەبایی و، یەکڕیزیی و برایی | ٦٢ |
| | چاپی یەك/١٩٩٩ | مزگەوتەکانی کوردستان لەنێوان ئاوەدانکردنەوەو وێرانکردندا | ٦٣ |
| | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی پێنج/٢٠١٠ | گەڕانەوە بۆ لای خــوا (سبحانە وتعالی)، بەرەو خوا وەرچەرخان و، وازهێنان لە گوناه و سەرپێچیی و، گۆڕانکاریی ڕیشەیی بەسەر خۆدا هێنان | ٦٤ |
| | چاپی یەك/٢٠٠٢ | شـەهید کێیەو چ پلـەوپایەیەکی هـەیە ؟! | ٦٥ |
| | چاپی یەك/٢٠١٥ | باسێك لەبارەی بینینی خوای بەرزو مەزنەوە، لەدنیاو دواڕۆژدا | ٦٦ |
| | چاپی یەك/٢٠١٥ | گیانی ژیــان: باش خوا پەرستن و خۆ پاك و چاك كردن | ٦٧ |
| | چاپی یەك/٢٠١٦ | مەوسـوعەی: ڕەوشت و ئاکاری ئیسـلامیی لەبەر ڕۆشـنایی قورئان و سـوننەتدا | ٦٨ |
| | چاپی یەك/٢٠٢٠ | ئەدەب و ڕەوشتە کۆمەڵایەتییەکان لەبەر ڕۆشنایی وەحیی و عەقڵدا | ٦٩ |
| | | بانگـەوازو کاری ئیسـلامیی | |
| | چاپی یەك/١٩٨٨ | کۆمەڵـی خــوا | ٧٠ |
| | چاپی یەك/١٩٨٨<br>چاپی چوار/٢٠٢٠ | پێشمەرگەی ئیسـلام، یان مسـوڵمانی موجاهید کآیەو چۆنە؟ | ٧١ |
| | چاپی یەك/١٩٩٠ | دەردو دەرمانی بزووتنەوەی ئیسـلامیی | ٧٢ |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٧٣ | بزووتنەوەی ئیسلامیی لە دووڕیانی مان و نەماندا | چاپی یەك/١٩٩٣ | |
| ٧٤ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و قۆناغی نوێ | چاپی یەك / ١٩٩٤ | |
| ٧٥ | هەڵسەنگاندن و هەڵوێستمان لەم قۆناغە | | |
| ٧٦ | تێگەیشتن | چاپی یەك/ ١٩٩٦ | |
| ٧٧ | چەند ڕێڕووونییەك بۆ ئیسلامییەكانی كوردستان | چاپی یەك / ١٩٩٧ | |
| ٧٨ | بزووتنەوەی ئیسلامیی و ئاسۆیەكی گەش و ڕوون، بنەما شەرعییەكان و بنچینە ئەخلاقییەكان | چاپی یەك/ ١٩٩٧ | |
| ٧٩ | ئیسلام و كێشە هەنووكەیی یەكان | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٨٠ | زانایانی ئیسلام كێن و چۆنن ؟! | چاپی یەك/ ٢٠٠٢<br>چاپی سێ / ٢٠١١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٨١ | كۆمەڵی ئیسلامیی: ئامانج و هەڵوێستەكانی | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٢ | هەڵسوكەوت لەگەڵ خەڵكی دا و، چەند ئامۆژگارییەك بۆ ئەندام و موجاهیدانی كۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕراوەتە سەر زمانی عەرەبی |
| ٨٣ | چۆن لە جیهاد تێ بگەین؟ | چاپی یەك / ١٩٩٨ | |
| ٨٤ | جیهاد لە ڕێی خواداو چەند سەرنج و ئاگادارییەك | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٥ | جیهاد لەڕێی خوادا/ بۆ ئەوەی بەهەڵە لەجیهاد تێنەگەین و لەسەر جەنگ كردنمان قەرزدار نەبینەوە | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٨٦ | جیهاد لە ڕێی خوادا چی یەو بۆچی دەكرێ و چۆن دەكرێ ؟ | چاپی یەك / ٢٠٠٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٨٧ | چەند ڕێـڕوونییـەك بۆ خوشــك و برایانمان لە هەنـدەران | چاپی یەك/ ٢٠٠٢ | |
| ٨٨ | ئیسـلام و مسـوڵمانەتیی و کاری ئیسـلامیی، لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك/٢٠٠٦ | |
| ٨٩ | هاوپەیمانێتی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سـوننەتدا | چاپی یەك / ٢٠٠٩ | |
| ٩٠ | بەشدارییکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا، هەڵسـەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانە | چاپی یەك / ٢٠٠٩<br>چاپی دوو / ٢٠١٣ | چاپی یەکەم بە دوو ئاڵقەی جیاوازو بە دوو ناونیشانی جیاواز کراوە، بەم شێوەیە:<br>ئاڵقەی یەکەم: بەڵگەکانی ئەوانەی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا بەشەرعیی نازانن و هەڵوەشاندنەوەیان.<br>ئاڵقەی دووەم : بەڵگەکانی ڕەوایی بەشداریکردن لە هەڵبژاردن و پەرلەماندا |
| ٩١ | هەڵوەشاندنەوەی بیـروڕاو ڕەفتارە پەڕگیـرانەکانی ڕێکخراوی (داعش) | چاپی یەك/ ٢٠١٥<br>چاپی دوو/٢٠١٧ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٩٢ | با لادان و تاوانی پەڕگیران، بەرانبەر بە ئیسـلام نەمانخاتە دوودڵـیی و گومان | چاپـی یەك/٢٠١٥ | وەرگێڕاوەتە سەر زمانی فارسیی |
| ٩٣ | پەڕگیریی: پێناسەی، نیشانەکانی پەڕگیران، هۆکارەکانی پەڕگیریی، شـوێنەوارو دەرهاویشتەکانی، چارەسەری | چـاپی یەك/ ٢٠١٥ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ٩٤ | بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| ٩٥ | هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامی | چاپی یەك/ ٢٠١٩ | |
| ٩٦ | کێ شایستەی مینبەر و میحرابە | چاپی یەك/ ٢٠٢٠ | |
| | زنجیرەی بنەما شەرعییەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی | | |
| ٩٧ | ئاڵقەی یەکەم: بەڵگە شەرعییەکانی بنیاتنانی کۆمەڵی ئیسلامیی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩٨ | ئاڵقەی دووەم و سێیەم: حوکمی لادانی خەلیفەو کاربەدەستانی مسوڵمان لەکاتی لاریی و ستەمکارییدا | چاپی یەك / ٢٠٠١ | |
| ٩٩ | ئاڵقەی چوارەم : شێخ ئەبو بەصیرو هەڵسەنگاندنێکی شەرعییانەو ژیرانەی فەتوانامەکەی | چاپی یەك / ٢٠٠١ | وەرگێڕدراوەتە سەر زمانی عەرەبیی |
| | وتاری کۆنگرەکانی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان | | |
| ١٠٠ | کارو پرۆژەی ئیسلامییمان (وتاری کۆنگرەی یەکەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠٠٥<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٠١ | ڕاپۆرتی : ئیمانیی، فیکریی، سیاسیی کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان (وتاری کۆنگرەی دووەمی کۆمەڵی ئیسلامیی) | چاپی یەك/٢٠١٠ | |
| ١٠٢ | چاوپێداگێڕانەوەیەکی بارودۆخی نێوخۆمان و واقیعی دەرەکییمان (وتاری کۆنگرەی سێیەمی کۆمەڵی ئیسلامیی)، ٣٠ /٥/ ٢٠١٥ | چاپی یەك/٢٠١٦ | |
| | نەتەوایەتیی و مەسەلەی کورد | | |
| ١٠٣ | کوردستان بۆ وێران بوو و چۆن ئاوەدان دەبێتەوە؟! | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |
| ١٠٤ | مەسەلەی کورد چیە و چۆن و بەچی چارەسەر دەکرێ؟ | چاپی یەك / ١٩٨٩ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێبیـنـی |
|---|---|---|---|
| ١٠٥ | حوکمی گەڕانەوە ژێر نیـری طاغوت لە ڕوانگەی ئیسـلامەوە | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی دوو/٢٠٠٥ | |
| ١٠٦ | سـۆزی نەتەوایەتیی و بیری ناسـیۆنالیزم لە تەرازووی ئیسـلامدا | چاپی یەك/١٩٩٠<br>چاپی سێ/٢٠٠٥<br>چاپی چوار/٢٠١٨ | |
| ١٠٧ | چارەســەری کێشـەی کورد لە نێوان ئیمان و پەرلەماندا | چاپی یەك/١٩٩٢ | |
| ١٠٨ | چەند ڕێنموویيەك بۆ حاڵەتی ئیسلامیی لە کوردستاندا | چاپی یەك/١٩٩٦ | |
| ١٠٩ | جەژنی قوربان و جەنگی قەڵاتووکان | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |
| | سیاسـەت و حوکمڕانیی | | |
| ١١٠ | چەند بابەتێکی سیاسـی هاوچەرخ لەبەر ڕۆشـنایی عەقـڵ و وەحییدا | چاپی یەك / ٢٠١٠ | |
| | مەوســووعەی: ئیســـلام و دەوڵـەتداریی، (٤ بەرگ) | | چاپی یەك / ٢٠١٤ |
| ١١١ | بەرگی یەکەم: قەوارەی سیاسیی لەئیسلامدا: بەڵگەکانی پێویستبوونی، چۆنیەتی بنیاتنانی، سروشت و بناغەی فیکریی، پێناسەی چەند وشەو زاراوەیەك | | |
| ١١٢ | بەرگی دووەم: بنەمایەکانی سیستمی حوکمڕانیی لەئیسلامدا | | |
| ١١٣ | بەرگی سێیەم: (سێ دەستەڵاتەکان):<br>یاسادانان - جێبەجێکردن - دادوەریی | | |
| ١١٤ | بەرگی چوارەم: نا مسوڵمانان لە کۆمەڵگاو دەوڵەتی ئیسلامییدا | | |
| ١١٥ | ڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ واقیعی ئێستامان | | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی دوو/٢٠١٧ |
| ١١٦ | قورئان و پاکسازیی و چاکسازیی لە هەرێمی کوردستاندا | | چاپی یەك/٢٠١٨ |
| ١١٧ | گرنگیی ڕەوشت لەسیاسەتدا | چاپی یەك/٢٠١٩ | |
| ١١٨ | واقیعی دژواری ئۆممەت هۆکار و چارەسەر | چاپی یەك/٢٠٢٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
| --- | --- | --- | --- |
| | ئافرەت و خێزان | | |
| ١١٩ | ئافرەتی مسـوڵمانی کورد، مافە شەرعییەکانی و ئەرکە گرنگەکانی | | چاپی یەك / ٢٠٠٣<br>چاپی دووەم / ٢٠٠٣ |
| ١٢٠ | مەوسـووعەی : ئـافرەت و خێزان لە سـایەی شــەریعـەتدا | بەرگی یەکەم چاپی یەك/٢٠٠٢<br>بەرگی یەك و دوو چـاپی سێ/٢٠١٣ | |
| | مـێــــژوو | | |
| ١٢١ | پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، دەرس و پەندەکانـی | چاپی یەك/٢٠٠٩<br>چاپی سێ/٢٠١٣ | |
| ١٢٢ | چەند مەڵۆیەك لە خەرمانی تەمەنم (بیرەوەرییەکانم)، بەشی یەکەم (١٩٦١-١٩٩١) | چاپی یەك/٢٠١٥ | |
| ١٢٣ | بەرکوڵێکی کاروچالاکیی و ڕووداوەکانی ژیانم (١٩٦١-٢٠١٧) | چاپی یەك/٢٠١٨ | بۆ هەردوو زمانی عەرەبیی و ئینگلیزیی وەرگێردراوە |
| | دیدارو گفت وگۆ | | |
| ١٢٤ | سـنووره قەدەغەکان مەشکێنن! (چاوپێکەوتنی دکتۆرحسـین محمد عزیز) | چاپی یەك/٢٠٠١<br>چاپی دوو/٢٠٠٤ | - |
| ١٢٥ | ئەشکەنجــەو زیندان، پێشمەرگەیەك بیست و دوو مانگ لە زینـدانی داگیـرکەردا | چاپی یەك / ٢٠٠٥<br>چاپی سێ/ ٢٠٠٩ | وەرگێڕراوەتە سـەر زمانی عەرەبی، هەروەها دوو تەرجەمەی فارسـیشی کراوەو چـاپ و بڵاوکراوەتەوە، هەروەها بۆزمانی ئینگـلیزیش وەرگێڕراوەوچـاوەڕێی چاپە |
| ١٢٦ | گەنج لە چەمکە هەنووکەییەکاندا | چاپی یەك /٢٠١٠ | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| | زنجیرەی بابەتە هەنووکەییەکان | | |
| ١٢٧ | گەنجەکانـمان لە نێوان ڕەسەنایەتیی و لاسایی کردنەوەدا (١) | چاپی یەك/ ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٢٨ | با وریا بین ! داڕووخـانی ڕەوشـت کۆمەڵگاکەمان بەرەو هەڵدێر دەبـات (٢) | چاپی یەك / ٢٠٠٢<br>چاپی دوو/ ٢٠٠٦ | |
| ١٢٩ | بەدوورخســتنەوەی ئافرەت لە ئیســلام چ زیانێـك دەکەین؟! (٣) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | - |
| ١٣٠ | چۆنیەتی بوونە پێشـەنگ و بنیاتنانی بنکەی جەماوەریی (٤) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣١ | سـیاسـەتی ئیسـلامیی و چەند ڕوونکردنەوەیەك (٥) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣٢ | چەند بنەمایەکی گرنگی وتاربێژیی (٦) | چاپی یەك / ٢٠٠٦ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٣٣ | قوتابیانی زانیاری شەرعیی و چەند سەرنج و ڕێنمایی یەك (٧) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣٤ | خوو ڕەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی مسـوڵمانەتییە (٨) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | |
| ١٣٥ | بانگەواز بۆ لای خودا چی یەو چۆنەو بە کێ دەکرێ؟ (٩) | چاپی یەك / ٢٠٠٧ | بۆ زمانی فارسییش وەرگێڕراوە |
| ١٣٦ | قوتابیان لەم هەل و مەرجەدا، پێویســتە چۆن بن و چی بکەن ؟! (١٠) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٣٧ | واقیعی هەرێمی کوردستان ، دیدێکی ئیسـلامییانە (١١) | چاپی یەك / ٢٠٠٨ | |
| ١٣٨ | سـروشـت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەندژنیی لە تەرازووی شەرع و عـەقـڵـدا (١٢) | چـاپی یەك/٢٠٠٩ | ئەم نامیلکەیە بە(١٤) ئاڵقـە لە ڕۆژنامەی (ڕۆژنامە)دا بلاوکراوەتەوە |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٣٩ | کاری ئیسلامیی و ڕەواندنەوەی چەند تەم ومژێك (١٣) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٤٠ | حوکمی لە ئیسلام هەڵگەڕانەوەو هەڵسەنگاندنێك (١٤) | چاپی یەك/ ٢٠١١ | |
| ١٤١ | مەلای گەورەی کۆیەو تەفسیرەکەی و چەند سەرنجێك (١٥) | چاپی یەك / ٢٠١١ | |
| ١٤٢ | لێکۆڵینەوەیەك لەبارەی : هەبوون و نەبوونی نەسخ لە قورئاندا (١٦) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٤٣ | ناقیکردنەوەی خوا بۆ بەندەکانی چی یەو چۆنە؟ (١٧) | چاپی یەك/ ٢٠٠٣<br>چاپی دوو/ ٢٠١٢ | |
| ١٤٤ | ڕەوەندی کورد لە هەندەران و ئەرکی سەرشانی (١٨) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٤٥ | خاتوون مەلاژن : ئافرەتێکی هەڵکەوتوو و هاوسەرێکی ناوازە (١٩) | چاپی یەك / ٢٠١٢ | |
| ١٤٦ | گەنج و قەیرانی ڕووحیی: هۆکار، شوێنەوار، چارەسەر (٢٠) | چاپی یەك ٢٠١٧ | |
| ١٤٧ | ژیان لەسایەی ئیماندا و ڕەواندنەوەی گومانەکان (٢١) | چاپی یەك/ ٢٠١٧ | |
| ب/کتێبە عەرەبییەکان | | | |
| | موسوعة : الإسلام كما يتجلّى في كتاب الله | ط الاولى/٢٠١٥ | |
| کە لە چاپی یەکەمدا (٨) بەرگەو، لە چاپی دووەمیدا لە (١٢) کتێبدا دەبێ، بەم شێوەیە: | | | |
| ١٤٨ | الكتاب الأول: الإسلام: معرفة صحيحة بالخالق عز وجل والخلق | ط الثانية/٢٠١٦ | |
| ١٤٩ | الكتاب الثاني: تعريف الإيمان | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٠ | الكتاب الثالث: الإيمان بالله تبارك وتعالى: الخالق الرب المالك الإله ذي الأسماء الحسنى والصفات العلى | ط الثانية/٢٠١٧ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٥١ | الكتاب الرابـع: الإيمان بالـملائكـة و بالـجـن | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٢ | الكتاب الخامس: الإيمان بكـتب الله الحكـيم | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٣ | الكتاب الســادس: الإيمان برسـل الله تعالـى وأنبيـائه الكـرام | ط الثانية/٢٠١٧ | |
| ١٥٤ | الكتاب الســابع: خاتم النبيين محمد صلى الله علية وسلم: موجز سـيرته وبراهين نبـوّتـه | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥٥ | الكتاب الثامن: الإيمان باليوم الآخر وموجز عن القدر | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥٦ | الكتاب التاسع: إهتداء الإنســان بهـدى الله، أو الإلتزام الفردي بشـريعة الله | ط الثانية/٢٠١٨ | |
| ١٥٧ | الكتاب العاشـر: إلتزام الـمجتمع بشريعة الله تعالـى | ط الثانية/٢٠١٩ | |
| ١٥٨ | الكتاب الحـادي عشـر: تطبيق الـمجتمع للشـريعة و معـالم الدولة فـي الإسـلام | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٥٩ | الكتاب الثاني عشــر: الإســلام: نظـرة سـديدة تجــاه الناس وتعامل صحيح معهم | ط الثانية/٢٠٢٠ | |
| ١٦٠ | نقض فـكـرة التطـرف | ط الاولى/٢٠١٦-لندن-، ط الثانية/ ٢٠١٧، -القاهرة (نقض التطرف ودحض أفكار المتطرفين) | |
| ١٦١ | ضـيف و قضـية (مقابلة مع قنــاة العربية) | ط الاولى/٢٠٠٦ | - |
| ١٦٢ | لقاء خاص (مقابلــة مع قنــاة العــالم) | ط الاولى/٢٠٠٦ | |
| ١٦٣ | حديث مختصر حول مايجري على الساحة العراقية | ط الاولى/ ٢٠١٦ | |
| ١٦٤ | طريق الصلاح والسير الى الله / تزكية النفس في ضوء القرآن والسنة | ط الاولى/٢٠١٢ | |

| ژ | کتێبەکان | بەرواری چاپ | تێبینی |
|---|---|---|---|
| ١٦٥ | أمير وراء القضبان | ط الاولى/ ٢٠٠٩<br>ط الثاني/٢٠١٣ | |
| ١٦٦ | مسائل عصرية رائجة | ط الثانية/٢٠١٤ | |
| ١٦٧ | قواعد مهمة في التعامل الشرعي الحكيم مع المسائل الفرعية الخلافية | ط الاولى/ ٢٠١١ | |
| ١٦٨ | علماء الإسلام من هم وماهي صفاتهم؟ | ط الاولى/ ٢٠٠٥<br>ط الثالثة/ ٢٠٢٠ | |
| ١٦٩ | الأُصول الشرعية والخطوط العامة للجماعة الإسلامية | ط الأولى/٢٠٠١<br>ط الثالثة/ ٢٠١٢ | |
| ١٧٠ | كيف نتعامل مع الناس؟ | ط الأولى/٢٠٠٢ | |
| ١٧١ | حوارات ساخنة حول قضايا راهنة، في ميادين الفكر والفقه والدعوة والسياسة | ط الاولى<br>والثانية/٢٠١٨ | |
| ١٧٢ | الديموقراطية والعلمانية في تجربة كوردستان | ط الأولى /٢٠١٧ | |
| ١٧٣ | خلاصة أحداث حياتي ونشاطاتي الفكرية والسياسية (١٩٦١-٢٠١٧) | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| ١٧٤ | نظرات فاحصة في قضايا شاخصة: الإسلام والأُمة، القضية الكوردية، الوضع العراقي | ط الأولى /٢٠١٨ | |
| | ئەو کتێبانەی لەژێر چاپن | | |
| ١٧٥ | تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز/: تاکو سوورەتی: (الناس) خوا پشتیوان بێ کارکردن تێیدا بەردەوام دەبێ، بۆ هەرچی زووتر چاپ کردنی | | |
| | مەوسووعەی: بەرەو باشتر تێگەیشتن و پێگەیشتن | | |
| ١٧٦ | بەرگی یەکەم: واقیعی دژواری ئۆممەت: هۆکارو چارەسەر | | |
| ١٧٧ | بەرگی دووەم: هەڵسەنگاندنێکی کاری ئیسلامیی | | |
| ١٧٨ | بەرگی سێیەم: چۆنیەتی گۆڕینی کۆمەڵگا و پاکسازیی و چاکسازیی تێداکردنی | | |

| ژ | کتێبەکان | بەروارو چـاپ | تێبینـی |
|---|---|---|---|
| ١٧٩ | بەرگی چوارەم: بەرەو بانگەوازێکی ڕاست و ڕەسەن | | |
| ١٨٠ | بەرگی پێنجەم: پایەکانی بووناسیی و، ڕوونکردنەوەی ئیمان | | |
| ١٨١ | بەرگی شەشەم: خواپەرستیی, تەزکیە, تەقوا | | |
| ١٨٢ | بەرگی حەوتەم: بنەما گشتییەکانی ڕێبازی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٨٣ | بەرگی هەشتەم: تایبەتمەندییە ئیمانیی و فیکرییەکانی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٨٤ | بەرگی نۆیەم: ڕەوشتبەرزیی دروشمی سەرەکیی جەماوەری مسوڵمانان | | |
| ١٨٥ | بەرگی دەیەم: چوار بابەتی سیاسی گرنگ و هەستیار | | |
| ١٨٦ | بەرگی یازدەیەم: بنچینە گرنگەکانی تەبایی و یەکڕیزیی مسوڵمانان | | |
| ١٨٧ | بەرگی دوازدەیەم: بنەڕەتەکانی مسوڵمانەتییەکی ڕاست و هاوسەنگ | | |
| ١٨٨ | قورئان و سوننەت وەك ڕوح و جەستە تێكهەڵكێشن | | |

# کورتەیەك لە مێژووی ژیانی
# مامۆستا عەلی باپیر

ناو: عەلی بـاپیر وەتمان



لەدایکبووی: ساڵی (١٩٦١ز)دا لەقەزای پشـدەر سەر بەپارێزگای سلێمانیی.

• زانیارییە ئیسلامییەکانی لە پەیمانگای ئیسلامیی (ڕانیەو سلێمانیی)و لە لای زانایانی کوردستانی عێراق و (دواتریش کوردستانی ئێران) بەدەستهێناون، لەساڵی (١٩٨٠ز)دا قورئانی بەپێزی لەبەر کردوە.

• لەســـــاڵی (١٩٨١ز)دا لەلایـــەن ڕژێمی بەعسەوە بڕیاری دەستگیرکردنی دراوە، هەربۆیە ئەوکات عێراقی جێهێشتوەو ئاوارەی ئێران بووە، کە ئەوکاتە لە قۆناغی دووەمی زانکۆ بووە، کۆلیجی شەریعەت.

• لەســـاڵی (١٩٨٣ز)دا گەڕاوەتەوە کوردســـتانی عــێراق و لە بەڕێوەبەرایەتی ئەوقافی هەولێر تاقیکردنەوەی ئیمامەتی داوەو، لە مزگەوتی (نۆڕسیی) لە شاری ڕانیە دامەزراوەو، بەردەوام بووە لەسەر دەرس گوتنەوەو بانگەوازی ئیسلامیی و... هتد.

• یەکەمین بەرهەمی لەساڵی: (١٩٨٣)زدا نووسیوە بەناوی: (پوختەیەك دەربارەی ئیسلام) پاشان کتێب و بەرهەمەکانی بەردەوام بوون کە ئێستا ژمارەیان لەسەد (١٠٠) تێپەڕیوە، لە مەوسووعەو کتێب و نامیلکەو، بەزمانی کوردیی و عەرەبیی و، هەندێك لە کتێبەکانیشی کە بەزمانی کوردیی نووسیونی، بۆ زمانەکانی: عەرەبیی و، فارسیی و، تورکیی و، ئینگلیزییش وەرگێڕراون.

• لەساڵی (١٩٨٧ز)دا پاش ساڵانێك لە خەباتی ئاشکراو نهێنیی پەیوەست لەگەڵ {بزووتنەوەی پەیوەندیی ئیسلامیی}دا، کە لەکۆتایی حەفتایەکانی سەدەی پێشوودا ڕێکخستنە نهێنییەکانی دامەزران، چۆتە چیاو دەستی بەخەباتی چەکداریی کردوە لە چوارچێوەی بزووتنەوەی ئیسلامییدا، کە لەچەند ناوچەیەکی کوردستاندا بنکەو بارەگای سەربازیی هەبوو دژی ڕژێمی بەعس و، هێزی حەمزەی لە بناری چیای قەندیل دامەزراند.

• لە ساڵی (١٩٨٨ز)دا بووە بە ئەندامی مەکتەبی سیاسیی بزووتنەوەی ئیسلامیی.

• لەساڵی (١٩٩١ز)دا ڕۆڵی هەبووە لەڕاپەڕینی ئازاری (١٩٩١ز)داو وریاکردنەوەی خەڵکی کوردستان، لە مەبەست و ئامانجەکانی ڕاپەڕینی جەماوەریی و ناساندنی بزووتنەوەی ئیسلامییدا.

• تاکو ساڵی (٢٠٠١ز) لەنێو بزووتنەوەدا درێژەی بەخەباتی خۆی داوەو، لەهەمان ساڵدا لەگەڵ زۆربەی هەرە زۆری هێزو مەڵبەندەکانی بزووتنەوەی ئیسلامیی لەبەر چەند هۆکارێکی مەنهەجیی (کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان) ڕاگەیانراو بەئەمیری کۆمەڵی ئیسلامیی هەڵبژێردرا.

• لە (٢٠٠٣/٧/١٠ز) لەسنووری سلێمانیی لەلایەن هێزەکانی ئەمەریکاوە بەتۆمەتی ناڕەوا دەستگیرکراو، بۆ ماوەی (٢٢) مانگ لەزینداندا مایەوەو، هەر لەزینداندا مەوسووعەی: (الإسلام کما یتجلي في کتاب الله)ی لە دوازدە کتێب و زیاتر لە چوار هەزار (٤٠٠٠) لاپەڕەدا نووسیی و، لە (٢٠٠٥/٤/٢٨ز)دا لەزیندان ڕزگاری بوو.

• تا ئێستا زیاتر لە (١٠٠) بەرهەمی هەیە لە: مەوسووعەو کتێب و نامیلکە، لەبوارەکانی: (فیکری ئیسلامیی و عەقیدەو فیقهو حوکم و سیاسەت و تەزکیەی نەفس و ئەخلاق و، بەرپەرچدانەوەی بیرو ڕێچکە نامۆیەکان و...هتد)دا.

• لە هەڵبژاردنەکانی ساڵی (٢٠١٠-٢٠١٤ز)دا، بۆ ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لەسەر بازنەی پارێزگای هەولێر کاندید بووەو، دەنگی یەکەمی هێناوە، زیاتر لە (٦٠،٠٠٠) دەنگ.

- کۆمەڵی ئیسلامیی تائێستا سێ کۆنگرەی بەستوە، لەساڵانی: (٢٠٠٥ و ٢٠١٠ و ٢٠١٥ز) داو، لەهەموویاندا، بەئەمیر هەڵبژێردراوەتەوە.
- ئێستا پڕۆژەی تەفسیرکردنی قورئانی بەرزو بەپێزی دەستپێکردووە، تا ئێستا چەند بەرگێکی لێ چاپ و بلآوکراوەتەوە.

بۆ زانینی زیاتر لەسەر ژیانی دانەر، سەردانی لینکی خوارەوە بکەن:

www.alibapir.net

# نێوەڕۆك

## بەشی سێیەم



## بەشی چوارەم

**بەشی پێنجەم**

## بەشی شەشەم



## بەشی حەتەم

# گەڕانەوە بۆ لای خوا

ئەم کتێبە

لێکۆڵینەوەیەکی پشوودرێژانەیە، لەبارەی بەرەو خوا گەڕانەوە (توبة)وەو، تێیدا تیشک خراوەتە سەر:

- چەمک و واتای بەرەو لای خوا گەڕانەوە.
- حوکمی بەرەو لای خوا گەڕانەوەو تۆبەکردن لە گوناهـ و سەرپێچییەکان.
- شێوازو چۆنیەتیی تۆبەکردن و تۆبەی ڕاست و ساغ (التوبة النصوح).
- مەرجەکانی تۆبەی ڕاست و ساغ و، هۆکارو فاکتەرەکانی سەروبەرگرتنی.
- ئەو شتانەی پێویستە تۆبەیان لێبکرێ.
- شوێنەواریی خراپ و شوومی گوناهـ و تاوان، بۆ تاک و کۆمەڵ.
- کاریگەریی تۆبە لە سڕینەوەی گوناهدا.
- بەرهەم و شوێنەواری تۆبە لە چاککردنی مرۆڤدا.
- کاریگەریی گەڕانەوە بۆ لای خوا -سبحانه وتعالى- لەرووی: ئیمان و عەقیدەو، خواپەرستیی و ، خوو و ڕەوشت و، کۆمەڵایەتیی و، جەنگ و جیهادو، حوکمڕانیی و سیاسییەوە.

 www.alibapir.net

 /alibapir1

 /alibapir




**نوسینگەی تەفسیر**

بۆ بڵاوکردنەوە

هەولێر - شەقامی ٦٠مەتری تەنیشت منارەی چۆڵ

     /TafseerOffice

                

+964 750 818 08 66

www.al-tafseer.com

tafseeroffice@yahoo.com


